# إبن الصلاح الشهرزوري

## (٥٧٧ك/١١٨١ز – ٦٤٣ك/١٢٤٥ز)



## ڕۆڵ و پێگەی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و زانستیدا

سابیر عثمان مصطفى

# إبن الصلاح الشهرزوري

## (٥٧٧ك/١١٨١ز – ٦٤٣ك/١٢٤٥ز)

---

**ڕۆڵ و پێگەی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و زانستیدا**

---

**سابیر عثمان مصطفى**

سەرماوەز ٢٧١٤ کوردی          سەفەر ١٤٣٦ کۆچی          کانونی یەکەم ٢٠١٤ زایینی

# ابن الصلاح الشهرزوري

نووسەر: سابیر عثمان مصطفی

دیزاین : لاوین خلیل هیدایەت مام شێخ

بەرگ: خلیل هیدایەت مام شێخ

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٦

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (٧٢٨) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە.

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللّٰهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾

سورة فاطر/ ٢٨

## سوپاس و پێزانین:-

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە، کە بە ویستی ئەو هەلی گەیشتنم بەم قۆناغەم بۆ ڕەخسا، وە بە پێویستی دەزانم؛ کە ڕۆڵی هەموو ئەوانە بنرخێنم، کە لە بەڕێوەچوونی خوێندن و تەواوکردنی ئەم نامەیەدا شوێن پەنجەیان دیارە. لە سەرەتادا سوپاسی بێ پایانم بۆ بەڕێز (پ.ی .د.امیدابراهیم جوزەلی)، کە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی نامەکەی گرتە ئەستۆ، کاتێکی زۆری خۆی بۆ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی تەرخان کرد، لە سەرەنج و پێشنیازەکانی زۆر سوودمەندبووم.

هەروەها زۆر سوپاس و دەست خۆشی خۆم ئاراستەی یەکە بە یەکەی ئەو مامۆستا بەڕێزانە دەکەم، کە لەمیانەی هەردوو کۆرسی خوێندنی باڵادا، لە گەڵماندا ماندوو بوون. هەروەها سوپاسی بەڕێز (م.خسرۆ) دەکەم، کە پێشنیازی نووسینی توێژینەوەکەمی لەسەر ئەو ناونیشانە کرد. دەست خۆشی لە هاوڕێی خۆشەویستم (م.ڕزگار عوسمان) دەکەم، کە ئەرکی وەرگێڕانی پوختەی توێژینەوەکەی لە کوردییەوە بۆ زمانی ئینگلیزی ئەنجامدا، وە سوپاسی (م. ئازاد عوسمان) دەکەم، کە ئەرکی پێداچوونەوەی زمانەوانی بۆ ئەنجامدام. هەروەها سوپاس و دەست خۆشیم بۆ هەریەکە لە (م.کامەران فتح الله) و( م.حسین شاکر) و (م.نوشیروان قادر) هەیە، لەگەڵ گشت ئەو مامۆستا و برادەرانەی، کە بە یەك هەنگاویش بێت هاوکاریان کردووم. هەروەها سوپاسی زۆری سەرجەم کارمەندە بەڕێزەکانی کتێبخانەکانی کوردستان دەکەم، کە تەواو هاوکار بوون و کارئاسانی زۆریان بۆ کردین،

بەتایبەتی(کتێبخانــەی ناوەنــدی هــەولێر، کتێبخانــەی زەیتونــەی هــەولێر و کتیبخانەی بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی هەولێر و کتێبخانـەی فاکەلتی ئادابی زانکۆی دهـوك). وە سوپاسـی تایبـەتم هەیـە بـۆ هاوڕێیـانی سـەردەمی خوێندنی باڵا، کە بەردەوام ڕێنمایی و ئاڵ و گۆڕی بیروڕاکانمان مایەی سوود و بایەخی زۆر بوون.

## پوختەی کتێب:-

ئەم کتێبە، کە تایبەتە بە ڕۆڵ و پێگەی (ابن الصلاح) لە بواری زانستی و ڕۆشنبیریدا، کە یەکێك بووە لە زاناو کەسایەتیە ناودارەکانی کورد، پێگەیەکی دیاری هەبووە لە نێو شارستانیەتی ئیسلامیدا و خاوەن چەندین بەرهەمی گرنگە.

توێژینەوەکە سەرەڕای پێشەکی و دەرەنجام، بەسەر سێ بەش دابەش کراوە، وێڕای ئەوەش لە کۆتاییدا، ئاماژە بە پاشکۆ و لیستی سەرچاوەکان کراوە. لە **بەشی یەکەمدا** باس لە ژیانی (ابن الصلاح) کراوە، کە لە چەند تەوەرەیەك پێك هاتووە:- لە **تەوەرەی یەکەم** ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی باسکراوە. لە **تەوەرەی دووەمدا** باس لە لەدایك بوون و پێگەیشتنی کراوە، وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، ئاماژە بە خانەوادەی کراوە، وە لە **تەوەرەی چوارەمدا**، تایبەتە بە مردنی(ابن الصلاح). هەروەها لە **بەشی دووەم** تیشك خراوەتەوە سەر لایەنی ڕۆشنبیری (ابن الصلاح)، وە چەند تەوەرەیەك لەخۆ دەگرێ، لە **تەوەرەی یەکەمدا**، باس لە گەشتی زانستی و مامۆستاکانی کراوە. لە تەوەرەی دووەم، باس لە قوتابیەکانی کراوە، وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، باس لە ڕۆڵی (ابن الصلاح) کراوە، لە بلاْوکردنەوەی زانستدا.

هەروەها لە **بەشی سێیەمدا**، باس لە پێگەی (ابن الصلاح) کراوە، لە چەند تەوەرەیەکدا:- **تەوەرەی یەکەم**، تایبەت کراوە بە ڕێبازی نووسینی (ابن الصلاح)، وە لە **تەوەرەی دووەمدا**، ئاماژە بەو سەرچاوانە کراوە، کە (ابن الصلاح) لە نوسینەکاندا، پشتی پێبەستوون، وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، وتەی

زانایان لەبارەی (ابن الصلاح)ەوە باس کراوە. لە **تەوەرەی چوارەمیشدا**، باس لە بەرهەمەکانی (ابن الصلاح) کراوە.

## هێما کورتکراوەکان:-

ت: توفي

ص: الصفحة

ص ص: الصفحات

ج: جزء

ط: الطبعة

هـ: التاريخ الهجرى

م: التاريخ الميلادى

د.م: دون مكان الطبع

د.ت: دون تاريخ الطبع

ق: القسم

ز: زايينى

ك: كۆچى

ل: لاپەڕە

ل ل: لاپەڕەكان

پ.ز : پيش زايينى

## پێرست

# پێشەکی :-

مێـژووی ئیسـلامی پڕیـەتی لـە کەسـانی بـە توانـاو لێهـاتوو، کـە لـە مـاوەی تەمەنیاندا، خزمەتێکی گەورە و بەرچاویان کردووە، بە شارستانیەتی ئیسلامی. ئەو زانـاو کەسـایەتیانەش، کـە ڕۆڵیـان گێـڕاوە، لـەم گەشەسـەندنە، تایبـەت نەبوونـە بـە نەتەوەیـەکی دیـاریکراو، بـەڵکو سـەرجەم نەتـەوەکان کاریگـەری خۆیـان هـەبووە، وە یەکێك لەو نەتەوانەش کوردبووە، کە چەندین زانـاو کەسـایەتی پایەبـەرزی، تیایـدا هەڵکـەوتووە؛ ڕۆڵ و کاریگـەری بەرچـاویان هـەبووە لـە پێشخسـتن و بنیاتنـانی شارستانیەتی ئیسلامی، بە درێژایی ئەو ماوە دیاریکراوەدا، جێ پەنجەیان دیاربووە و هیچیان کەمتر نەبووە لە نەتەوەکانی تر.

یەکێك لەو ناوچە و دەڤەرە گرنگە کوردیانەی، کە ژمارەیەکی زۆر لە کەڵەپیاو و زانای بەناوبانگی تێدا هەڵکەوتووە، ناوچەی شارەزوورە لـە مێـژووی ئیسـلامی، بـە شێوەیەك، کـە نـاوی شـارەزوور لای زۆرێـك لـە مێـژوونووس و نوسـەرانی سـەرجەم ناوچـە جیاجیاکـان ڕوونـەو ئاشـنان پێـی. یـەکێك لـەو زانایانـەش (ابـن الصـلاح الشهرزوری)یە، کە لەو ناوچەیەدا هەڵکەوتووە. زانـاو کەسـایەتیەکی کـەم وێنـەبووە، لـە زۆرێـك لـە زانسـتە شـەرعیەکان. هـەوڵی زۆریـداوە لـە پێشخسـتن و پەرەپێـدانی زانسـت و زانیـاری، زۆر ناوچـە گـەڕاوە بـۆ ئـەم مەبەسـتەش، ئـەو گـەڕان و گەشـتە زانسـتیانە؛ لێکەوتـە و دەرەنجـامی گـەورەی هـەبووە، لەسـەر ژیـانی، وە توانیویـەتی چەندین نوسراو و بەرهـەمی گرنـگ و نایـاب پێشـکەش بکـات، کـە لـە دوای خۆیشی بووە سەرچاوەیەکی گرنگ و پڕبایەخ، بۆ زاناکان و پشتیان پێ بەستووە، لە نووسین و بەرهەمەکانیان.

گرنگی توێژینەوەکە لەوەدایە، کە تاکو ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی لەسەر کەسایەتی و ڕۆڵ و پێگەو بەرهەمەکانی (ابن الصلاح) بە زمانی کوردی نەکراوە، تاوەکو بیرو بۆچوونە زانستیەکانی خرابنە تەرازووی لێکدانەوەی زانستیانە، کە پێویستیەکی گرنگە بۆ نەوەی نوێمان و ئاشناکردنیان بە زانایەکی گەورەی وەکو (ابن الصلاح الشهرزوری) .

هۆکاری هەلبژاردنی ئەم بابەتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆڵ و پێگە گەورەی (ابن الصلاح)، کە لە بزاڤی ڕۆشنبیری و زانستی دا هەیبووە، لەناو شارستانیەتی ئیسلامیدا، پاڵنەرو هۆکاری سەرەکی بوون، بۆ هەلبژاردنی ئەم بابەتە.بۆیە لەبەر گرنگی زانیاریەکان بە پێویستمان زانی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکەین، شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی زانستی، بۆ ژیان و پێگەی زانستی و بەرهەمەکانی بکەین، لە چوارچێوەی توێژینەوەیەك بەناونیشانی (ابن الصلاح الشهرزوری، ڕۆل و پێگەی لە بزاڤی زانستی و ڕۆشنبیریدا) بخەینەڕوو.

سەبارەت بەو کۆسپ و تەگەرانەی، کە لە کاتی نووسینی ئەم لێکۆڵینەوە یەدا، هاتۆتە بەردەممان، لە هەموو ئاستەنگەکان بەرچاوتر، بریتی بوو لە:- کەمی زانیاری پێویست لەبارەی بنەماڵەی (ابن الصلاح)، وە هەروەها کۆسپێکی تر بریتی بوو:- لەو بارودۆخە نەمنیە ناسەقامگیرەی، کە ناوچەکەی پێدا تێپەردەبوو لەو ماوەیەدا، بەتایبەتی (وڵاتی شام)، کە شوێنی پێگەیشتن و خزمەتی زۆری (ابن الصلاح)بووە، کە حەزمان دەکرد لە نزیکەوە سەردانی مەیدانی ئەو ناوچانە بکەین، بەمەبەستی وەرگرتنی سوود و زانیاری وردتر، لەسەر ژیان و هەوڵە زانستی و ڕۆشنبیریەکانی (ابن الصلاح الشهرزوری).

ئەم توێژینەوە، کە تایبەتە بە ڕۆڵ و پێگەی (ابن الصلاح الشهرزوری) لە بواری زانستی و ڕۆشنبیری دا، بۆ پێشەکی و سێ بەش دابەش کراوە، هەر بەشێکیش چەندین تەوەرە لەخۆ دەگرێت، لە **بەشی یەکەمدا** باس لە ژیانی (ابن الصلاح) کراوە، کە لە چەند تەوەرەیەك پێك هاتووە:- لە **تەوەرەی یەکەم** ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی باسکراوە. لە **تەوەرەی دووەم** باس لە لەدایك بوون و پێگەیشتنی کراوە،

وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، ئاماژە بە خانەوادەی کراوە، وە لە **تەوەرەی چوارەمدا**، تایبەتە بە مردنی(ابن الصلاح). هەروەها لە **بەشی دووەم** تیشك خراوەتەوە سەر لایەنی رۆشنبیری (ابن الصلاح)، وە چەند تەوەرەیەك لەخۆ دەگرێ، لە **تەوەرەی یەکەمدا**، باس لە گەشتی زانستی و مامۆستاکانی کراوە. لە **تەوەرەی دووەم**، باس لە قوتابیەکانی کراوە، وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، باس لە رۆڵی (ابن الصلاح) کراوە، لە بڵاوکردنەوەی زانستدا.

هەروەها لە **بەشی سێیەمدا**، باس لە پێگەی (ابن الصلاح) کراوە، لە چەند تەوەرەیەکدا:- **تەوەرەی یەکەم**، تایبەت کراوە بە رێبازی نووسینی (ابن الصلاح)، وە لە **تەوەرەی دووەمدا**، ئاماژە بەو سەرچاوانە کراوە، کە (ابن الصلاح) لە نوسینەکاندا، پشتی پێبەستوون، وە لە **تەوەرەی سێیەمدا**، وتەی زانایان لەبارەی (ابن الصلاح)ەوە باس کراوە. لە **تەوەرەی چوارەمیشدا**، باس لە بەرهەمەکانی (ابن الصلاح) کراوە.

لە کۆتاییدا ماوەتەوە بڵێم، کە هیوادارم توێژینەوەکەم خزمەتێکی کردبێت، بە دەرخستنی رۆڵی ئەو زانا کوردە، لە شارستانیەتی ئیسلامیدا و ناساندنی بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی، لەگەڵ ئەوەشدا، دڵنیام، کە توێژینەوەکەم بێ کەم و کوڕی نییە، چونکە تەنها خوای پەروەردگار بێ کەم و کوڕیە.

## شيكردنەوەی سەرچاوەكان:-

بۆ نووسین و ئامادەكردنی ئەم توێژینەوەیە، پشتمان بەستووە بە كۆمەڵێك سەرچاوەی كۆن و نوێ، هەریەكەیان بە ڕێژە و ئاستی جیا جیا، بە پێی زانیاریەكان سوودیان لێوەرگیراوە. لێرەدا، لەبەرئەوەی ژمارەیان زۆرە، گرنگترینیان شیكردنەوەیان بۆ دەكەین و دەیانخەینەڕوو، بەتایبەتی ئەوانەی، زۆر سوودیان گەیاندووە بە لێكۆڵینەوەكە، ئەوانەی تریش لە لیستی سەرچاوەكاندا، ئاماژەی پێكراوە .

## ١-سەرچاوەكانی ژیاننامە و كتێبەكانی سەربوردەكان:-

لەبەرئەوەی، بەشێكی زۆری توێژینەوەكە، باسی كەسایەتی دەكات، ئەم جۆرە سەرچاوانە سوودی زۆریان هەبووە لە ناساندنی كەسایەتیەكان، لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەش:- كتێبی (وفیات الاعیان وانباء ابناء الزمان)ی ابن خلكان(م٦٨١ك/١٢٨٢ز) سەرچاوەیەكی گرنگ بووە بۆ ئەم لێكۆلینەوەیە، لەبەر ئەوەی، ناوبراو بۆ خۆی لە چوارچێوەی دەوڵەتدا، پۆستی جیاجیای وەرگرتووە و ناشنایەتی زۆری لەگەڵ سەرچاوەكاندا هەبووە، وە خەڵكێكی زۆری بینوە و شتی لێ بیستوون. هەموو ئەمانەی یاداشت كردووە و پاراستوویەتی، بۆیە كتێبەكەی بەشێكی زۆری ئەو زانا موسڵمانانەی لەخۆ گرتووە، كە لە سەدەكانی ناوەڕاست ژیاون، ئەمە جگە لەوەی بۆ خۆی كورد بووە، باسی بەشێكی باشی لەناودارانی كورد كردووەو ناساندونی.

هەروەها سوودی زۆرمان لە كتێبی(عیون الروضتین في اخبار الدولتین النوریة والصلاحیة)ی (ابو شامة) وەرگرتووە، كە گەلێك زانیاری گرنگی سەبارەت بە (ئەییوبی)ەكان تێدایە، ناكرێ مێژوونووس باسی (ئەییوبی)ەكان بكات بە بێ گەڕانەوە بۆ ئەم پەرتووكە، بۆیە بۆپشتڕاستكردنەوەی زانیاریەكانمان، پشتمان پێبەستووە. هەروەها سوودی زۆرمان لە كتێبی (الوافي بالوفیات)ی الصفدي (م٧٦٤ك/١٣٦٣ز) وەرگرتووە، كە ژیاننامە و سەربوردەی زۆرێك لە زانایان و ناودارانی

موسلمانانی له تەواوی بوارە جیاجیاکاندا لەخۆ گرتووە ، بەو پێیەی پلەو پێگەی باشی هەبووە، لە وڵاتی شام، له چوارچێوەی دەوڵەتدا کاری کردووە، بۆیە سوودی زۆری وەرگرتووە لە کتێب و دەستنووسەکان ، بەهۆی کارەکەیەوە تێکەڵاوی زۆری خەڵك بووە و زانیاری باشی گواستۆتەوە، ناوبراو

هەروەها بە یەکێك لەو نووسەرانە دادەنرێت، کە زانیاریەکانی زۆر بە وردی و دروستی تۆمارکردووە. هەروەها کتێبێکی تری الصفدی (اعیان العصر واعوان النصر)ە، کە نووسەر لەم کتێبەیدا ئاماژەی بە کۆمەڵێك لە زانا و کاربەدەست و کەسایەتی ناوداری وڵاتی شام کردووە، هەر بۆیە لەو کتێبەدا تا رادەیەکی باش ئەو کەسایەتیە کوردیانەی، کە رۆڵ و پێگەیان هەبووە لە وڵاتی شام، ناساندوونی و باسی کردوون. زانیاریەکانی ناو کتێبەکەی زۆر گرنگن، چونکە ئەو خۆی بیسەر و بینەری زۆر لە رووداوەکان بووە.

هەروەها کتێبی (طبقات الشافعیة)، کە دانراوی (ابن قاضی شهبة)یە (م٨٥١ك/١٤٤٨ز) ئەو سەرچاوە بەشێکی زۆری باسی زانایانی مەزهەبی شافعی کردووە، جگە لەمەش نووسەر، پلەی سەرۆکی دادوەران(قاضی قضاة)ی هەبووە، لە وڵاتی شام، وە بەهۆی پۆستەکەیەوە توانیویەتی سوودی زۆر لە سەرچاوەکانی پێش خۆی وەربگرێ؛ هەم ئاشنا بێت بە کۆمەڵێك کەسایەتی ناسراوی سەردەمەکەی خۆی، هەر لەو روانگەیەوە، کۆمەڵێك زانای مەزهەبی سوننی تیشکی خراوەتەسەر لە کتێبەکەیدا.

## ٢-سەرچاوەکانی مێژووی گشتی:-

بەشێوەیەکی گشتی، کتێبە مێژووییەکان، زانیاری گرنگیان تێدایە؛ بەدەر نین لە ناساندن و باس کردنی کەسایەتی و زانا ناودارەکان، لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەی، کە سوودمان لێوەرگرتوون (المختصر فی اخبار البشر)ی (ابو الفداء) (م٧٣٢ك/ ١٣٣١ز)، کە خۆی کاربەدەست و فەرمانڕەوای (حما) بووە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا، گرنگی زۆری بە زانست و زانیاری داوە، باسی لایەنی شارستانی

ولأتى (شام)و (مصر) كردووه، خۆشى كورد بووه و تيشكى خستۆته سەر هەندێ لە زانايان و كەسايەتيە كوردييەكان، بە پێى پێگە و فەڵەمڕەوی خۆی توانيويەتی بەڵگەو كتێبە گرنگەكان بەدەستبخات و مێژوويەكی ڕاست و زۆر گرنگمان بۆ بنووسێت لە ڕێگەی كتێبەكەيەوە.

هەروەها سودمان لەچەند كتێبەكانى (الذهبي) (م ٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز) وەرگرتووە، لە گرنگترينيان (تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام)ە، نووسەر لەم كتێبەيدا، لە تۆماركردنى ڕووداوە مێژووييەكاندا، شێوازی (خولی) بەكاهێناوە. (واتە ڕووداوە مێژووييەكانى ساڵ لە دوای ساڵى تۆمار كردووە)، وە لە ميانەی خستنەڕووی ڕووداوەكانيش، زۆرێك لە كەسايەتييە ديارەكانى ناساندووە، بەشێكى زۆری كتێبەكەی، بۆ ئەم بوارە تەرخان كردووە. يەكێك بووە لەو نووسەرانەی، لە نووسينەكانيدا، زۆر ورد بين بووە، هەربۆيە بۆ ناسينى زاناكان پشتمان بەو سەرچاوە بەستووە، چونكە لە دايك بوون و پێگەيشتن و مردنى بەشێكى زۆر لە زاناكانى ئامازە پێداوە، كە گرنگى تايبەتى خۆی هەيە، جگە لەم سەرچاوە چەندين سەرچاوەی تری وەكو (سير اعلام النبلاء)و (ذيل تاريخ الاسلام)و (معجم الشيوخ الكبير) بە پێى ڕێژەی جياواز سووديان لێوەرگيراوە.

يەكێكى تر لە سەرچاوەكان (السلوك لمعرفة دول الملوك)ی المقريزی (م٨٤٥ك/ ١٤٤١ز)، نووسەر بۆخۆی شايەتحاڵى زۆر لە ڕووداوەكان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا پشتى بە سەرچاوەی جۆراوجۆر بەستووە و سوودی لێوەرگرتوون، وە باسى زۆر لە زانا كوردەكانى كردووە لە كتێبەكەيدا، ڕۆڵ و پێگەيانى بەرز نرخاندووە.

## ٣-كتێبەكانى مێژووی شارو ئەنسكلۆپيديەكان:-

ئەم جۆرە سەرچاوانە زانيارى زۆر بەسوود و گرنگ و پوختيان تێدايە، لەگەڵ ئەوەی زانيارييەكان گشتگيرو جۆراوجۆرن، بەڵام سوودی تايبەتى خۆيان هەيە. يەكێك لەو سەرچاوە گرنگانە، كتێبى(تاريخ دمشق)ی (ابن عساكر) (م٥٧١ك/ ١١٧٦ز)، كە يەكێكە لەو سەرچاوانەی، زانيارى وردی تێدايە، بە تايبەتى لەسەر هەندێ

کەسایەتی، کە سوودی باشی لێوەرگیراوە، وە هەروەها یەکێکی تر لەو سەرچاوە گرنگانە، کتێبی(صبح الاعشی فی صناعة الانشا)ی القلقشندی (م٨٢٠ك/ ١٤١٧ز)، کە بە یەکێك لە گرنگترین ئەنسکلوپیدیا ئیسلامیەکان هەژمار دەکرێ، ئەم کتێبە زانیاری هەمەجۆری لە خۆ گرتووە، زۆربەی زانیاریەکانی تایبەتن بە لایەنی شارستانی .

هەروەها سودێکی باشمان لە زانیاریەکانی کتێبی (الدارس في تاريخ المدارس)ی (النعيمی) (٩٢٧ك/١٥٢٠ز) لە بواری شارستانی بە تایبەت قوتابخانەکان وەرگرتووە. هەروەها زانیاری زۆری لە بوارەکانی جوگرافیا و بەڕێوەبردن و مێژووی لە خۆ گرتووە، لەگەڵ ئەوەی زانیاریەکانی زۆربەی لە کتێبی (مسالك الابصار)ی (فضل الله العمري) (م٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز) وەرگرتووە.

## ٤-سەرچاوە جوگرافی و وڵاتناسیەکان:

گەریدەو وڵاتناسە موسڵمانەکان، لە سەدەکانی ناوەڕاست ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە ناساندنی جیهانی ئیسلامی، بۆیە سوودمان لە چەند دانراوێکی جوگرافیناسان وەرگرتووە، لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەش کتێبی (معجم البلدان)ی (یاقوت الحموی) (م٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز)، کە یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکان، کە لەم توێژینەوە سوودی لێوەرگیراوە، نووسەری ئەم کتێبە زانیاری زۆری جوگرافی ومێژووی تۆمارکردووە، کە هیچ توێژەرێك ناتوانێ فەرامۆشی بکات، زۆر ناوچەی جیاجیای ناساندووە، بۆیە دەبێت لە ناساندنی ناوچەکان پشتی پێببەسترێ.

هەروەها کتێبی (البلدان)ی (اليعقوبي) (م٢٩٢ك/٩٠٥ز) یەکێکی ترە لە بەرهەمی وڵاتناسان، کە باس لە هەواڵی وڵاتان و داب و نەریت و ئایینی ناوچەکان دەکات. لەم لێکۆلینەوە سوودی لێوەرگیراوە بۆ زانیاریە جوگرافیەکان. هەروەها کتێبی (اثار البلاد فی اخبار العباد) (القزوینی) (م٦٨٣ك/ ١٢٨٣ز)، کە بە یەکێك لە سەرچاوە گرنکەکان دادەنرێت و زانیاری زۆر بە سوودی لە بارەی جوگرفیا و ولاتناسی تێدایە و خزمەتی باشی توێژینەوەکەی کردووە.

## ٥-ژێدەرە نوێیەکان (المراجع):-

سەرچاوە نوێیەکانیش توێژینەوەکەیان دەوڵەمەندتر کردووە بەهۆی ئەوەی، کە زانیاریەکان لە لایەن نووسەرەکانیان شیکراونەتەوە، یاخود دەرەنجامی باشی تێداکراوە، یەکێك لەو سەرچاوە گرنگانەی، کە سوودی زۆری لێوەرگیراوە لە توێژینەوەکە کتێبی (الاعلام)ی (الزرکلی) (م١٣٩٦ك/ ١٩٧٦ز)، کە باسی زۆرێك لە کەسایەتی و زانا موسڵمانەکانی کردووە، بە ووردی تیشکی خستۆتە سەر ڕۆڵ و پێگەی کەسایەتیەکان.

یەکێکی تر لە سەرچاوە گرنگەکانی کتێبی (خطط الشام)ی (محمد کرد علی) (م١٣٧٢ك/ ١٩٥٣ز)، کە زانیاری زۆر بەسوودی تێدایە لە بارەی ژیانی زانایانی ناودارو بەرهەم و هەوڵ و بزاڤە زانستی و ڕۆشنبیریەکانیان، هەر بۆیە سوودی لێوەرگیراوە بۆ توێژنەوەکە.

یەکێکی تر لەو سەرچاوانە کتێبی ڕۆژهەڵاتناس (بروکلمان)ە (تاریخ الادب العربی)، کە ئاماژەی بە نووسەرە موسڵمانە ناودارەکان کردووەو بەشێوەیەکی پوخت ژیانیانی خستۆتەڕوو. هەروەها سەرچاوەیەکی تر، کە سوودی لێوەرگیراوە بۆ توێژینەوەکە، کتێبەکەی (احمد محمود الخلیل) بەناونیشانی (مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا)، کە باسی زۆر لە کەسایەتی و زانا کوردە موسڵمانەکانی کردووە. سەرچاوەیەکی کتێبەکەی (محمد علی الصویرکی) بەناوی (الموسوعة الکبری لمشاهیر الکرد عبر التاریخ) باسی ڕۆڵ و پێگەی کۆمەڵێك لە زانا دیارەکانی کوردی کردووە، کە خزمەتی زۆری بە شارستانی ئیسلامی کردووە، ئەمانەو چەندین سەرچاوەی تر سوودیان لێوەرگیراوە، کە ناکرێ لێرەدا ئاماژە بە هەموویان بکەین.

## دەروازە:-

## بارودۆخی سیاسی و کۆمەلأیەتی و رۆشنبیری وئابوری ولأتی ( شام ) بە تایبەتی شاری ( دیمەشق ) لە سەردەمی ( ابن الصلاح الشهرزوری ):-

### یەکەم: بارودۆخی سیاسی:-

سەردەمی (ابن الصلاح الشهرزوری) هاوکات بوو، لەگەڵ هاتنی دەسەلأتی(ئەییوبی)یەکان بۆ ناوچەکانی (شام)، بەتایبەتی شاری (دیمشق)، دوای مردنی سوڵتان (نورالدین زەنکی) لە ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز)، (صالح ئیسماعیل)ی کوڕی شوێنی گرتەوە؛ بەهۆی تەمەن بچووکییەوە، نەیتوانی کاروبارەکانی دەوڵەتی (زەنکی) بەشێوەیەکی رێك و پێك بەرێوەببات؛ بەمەش بارودۆخی وڵاتی (شام) لە رووی سیاسیەوە تووشی شپرزەیی و شلەژان بوو. ئەم بارودۆخە رێگە خۆشکەر بوو بۆ دەرکەوتنی دەسەلأتی (ئەییوبی)یەکان لە ولأتی(شام) بە تایبەتی دوای ئەوەی سوڵتان (صلاح الدین الایوبی) [1] توانی لە ساڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز) دەست بەسەر ناوچەکانی (شام) دابگرێت، بەتایبەتی شاری (دیمشق)، بەمەش سەردەمێکی نوێی حوکمڕانی (ئەییوبی)یەکان لە وڵاتی شام دەست پێدەکات [2] .

---

(١)(صلاح الدین الایوبی) یەکێك بوو، لە سەرکردە هەرە دیار و بە ناوبانگەکانی دەوڵەتی ئەییوبی، کە لە ساڵی (٥٣٢ك) لە (تکریت) لە دایك بووە و لە خانەوادەیەکی ناودار و خانەدان و بەناوبانگ گەورە بووە, کە بەرەچەڵەك کورد بووە و توانیویەتی لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) شاری (قودس) ئازاد بکات, کە ئەمەش ناوبانگی ئەو سەرکردەیەی بە هەموو جیهان ناساند.ابن شداد, النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة, تحقیق: جمال الدین الشیال, ط٢, مکتبة الخانجي, (القاهرة- ١٩٩٤ م), ص٣٢.

(٢) ابن الاثیر ، الکامل في التاریخ، تحقیق: عمر عبد السلام تدمري؛ دار الکتاب العربي، (بیروت-١٩٩٧)،ج٩،ص ص ٣٩٣،٣٩٨، ٤٠٤؛ ابن خلکان ، وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان, تحقیق: إحسان عباس, دار صادر, (بیروت-١٩٧١) ، ج٧،ص ص١٦٩_١٧٩؛ الذهبی ، تاریخ الاسلام, تحقیق: د.بشار عواد معروف, دار الغرب الإسلامي, (د.م-٢٠٠٣م), ج١٢، ص ص٥٩٦،٦٧٣.

ناوچـەکانی (شـام) لەگـەڵ خاچـییەکان هاوسـنوور بـوون؛ بۆیـە ئـەم ناوچـانە بـەردەوام لـە ململانێـی سیاسـی و سـەربازی دابـوون، (ئەییوبی)یـەکان دوای ئـەوەی، توانیان یەکپارچەیی زۆرێك لە ناوچەکانی (شـام)و (موصل)و (مصـر) بچەسـپێنن و شـاری (دیمشـق)یان کـردە ناوەنـدی هەڵمەتـەکان، بـۆ ئـازاد کردنـی ناوچـەکانی ژێـر دەسەڵاتی خاچیەکان، بەمەش توانرا بە درێژایی سەردەمی (ئەییوبی)یەکان، زۆریـك لە ناوچەکان لە ژێر چنگی خاچیەکان دەربهێنرێت، بە تایبەتی شاری (قودس) [1].

تێبینی ئەوە دەکرێ، کە سەردەمی (ابن الصلاح شهرزوری) هاوکات بووە لەگـەڵ ئـەو ململانـێ سیاسـی و سـەربازیەی، کـە لـە نێـوان جیهـانی ئیسـلامی و خاچـیەکان بوونی هەبوو.

لە سەردەمی سوڵتان (صلاح الدین الایوبی) سەقامگیری سیاسی تاڕادەیەکی باش لـە شـاری (دیمشـق) دروسـت بـوو، ئەمـەش کاردانـەوەی ئـەرێنی لەسـەر بزوتنـەوەی زانستی لەناوچەکە هێنایە کایـەوە [2]، بـەڵام لـەدوای مردنـی (صـلاح الـدین الایـوبی) ململانێـی سیاسـی لـە نێـو بنەماڵـەی (ئەییوبی)یـەکان سـەری هەڵـدا؛ بەمـەش بارودۆخی سیاسی (شام) بەرەو ناجێگیری ڕۆیشت و کاردانەوەی خراپی لەسەر گشت کایـەکانی کۆمەڵگـە بەجێهێشـت. لـەدیارترین ئـەو ململانێیانـەش:- کاتێـك مـەلیك (الافضل)ی کوری (صلاح الدین) بـووە فـەرمانڕەوای (دیمشق) لەلایـەن هەریەکـە لـە مـەلیك(العزیز)ی بـرای و مـەلیك (العـادل)ی مـامی هێرشـی کرایـە سـەرو بـەزۆر شارەکەیان پێ چۆڵ کرد [3].

---

(١) ابن خلكان ،وفيات الاعيان،ج٧،ص ص١٦٩_١٧٩؛ البير شاندور ، صلاح الـدين الايـوبي ، ت:سعيد ابو الحسن، (دمشق –د.س)، ص ص ٢٠٨_٢٠٩.

(٢) ناصر محمد علي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،رسالة ماجستيرمقدمة الى كلية الشريعة والدراسات الاسلامية،جامع القرى ،(سعودية:١٤٢١ك)ص ١.

(٣) سـبط ابـن الجـوزي، مـراة الزمـان في تـاريخ الاعيـان، تحقيـق:ابراهيم الزيبـق، الرسـالة العالمية، (دمشق–٢٠١٣) ، ج٣،ص٤٢٠؛ ابن العبري ، تاريخ مختصر الدول تحقيق: انطون صالحاني اليسوعي، دار الشرق، (بيروت–١٩٩٢) ،ص٢٣٧.

بەم شێوەیە ئەم ململانێیە ناوەخۆییە لە نێوان پاشایانی (ئـەیـوبی) تەشـەنەی کرد و بەردەوام بوو؛ تاوەکو مەلیك (صالح اسماعیل بن العادل) توانی دەست بە سـەر شاری (دیمشق) دابگرێت، بـۆ مـاوەی نێـوان سـاڵانی (٦٣٥ك) بـۆ(٦٤٣ك) فـەرمانڕەوای شارەکەی کرد. پاشان مەلیك (صالح نجم الدین) توانی لە ساڵی (٦٤٣ك) مەلیك (صالح اسماعیـل) لـە شـاری (دیمشـق) دەربکـات و فـەرمانڕەوای شـارەکەی گرتـە ئەسـتۆ، کـە هاوکاتە لەگەڵ مردنی (ابن الصلاح الشهرزوری) لەم شارەدا. دواتر مەلیك (صالح نجم الدین ایوب) بەهۆی شالاوی خاچییەکان بۆ سەر (شام) و ولاتی (میسر) دەگەڕێتـەوە (میسـر)، هـەر لەسـاڵی( ٦٤٧ك) کۆچی دوای دەکـات و (تـوران شـاه)ی کـوڕی دەبێتـە شوێنگرەوەی[1].

بۆمـان بەدەردەکەوێ، ململانێیـە سیاسیەکانی نێـو بنەماڵەی(ئەیوبی)یـەکان لەسەر فەرمانڕەوای کردنی شاری (دیمشق) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێگـە گرنگـەی، کـە (دیمشق) وەك ناوەندێکی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیریی لە شام هەیبوە.

## بـارودۆخی زانستی و ڕۆشنبیری:-

ئەو سەردەمەی، کە (ابن الصلاح) تێیدا ژیاوە؛ هاوکات بوو لەگەڵ دەرکەوتن و گرتنە دەستی دەسـەڵات لـە لایـەن (ئەییوبی)یـەکان لـە شـام، جوولەیـەکی زانسـتی و ڕۆشنبیری بـەرفراوان هـەبوو لـە ناوچـەکە، بەتایبـەتی لـە شـاری (دیمشـق)، ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گرنگی دانە زۆرەی، کە (ئەییوبی)یەکان هەیانبوو، بۆ ئەو بوارە و ڕۆڵـی گـەورەیان گێـڕاوە لـە پیشخسـتنی لایـەنی ڕۆشـنبیری بەتایبـەتی سـەردەمی سوڵتان (سەلاحەددینی ئەییوبی)، کە خۆی زۆر حەزی لە زانست و زانیـاری کـردووە

(١) ابن الوردي ، تاريخ ابن الوردي ، دار الكتب العلمية, (بيروت-١٩٩٦م), ج٢،ص١٦١ ؛ ابـن كـثير ، البدايـة والنهايـة، تحقيـق:علي شـيرى, دار إحيـاء الـتراث العربـي, (د.م-١٩٨٨م), ج١٣،ص١٩٦ ؛ ناصر محمد علي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي، ص ص٣٠_٣١.

بەتایبەتی لە بابەتە ئاینیەکان [1]؛ لەبەر ئەوەی (دیمشق) شارێکی گەورەی (شام) بووە، بۆتە پایتەختی سیاسی (ئەییوبی)یەکان لە (شام)، هەربۆیە گرنگیەکی زۆری لە لایەن (ئەییوبی)یەکانەوە پێدرابوو، بەتایبەتی لە بواری زانستی و ڕۆشنبیری، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی، زۆرێك لە زانایانی سوننە مەزهەب لەم شارەدا نیشتەجێبن. کە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی ڕوویات تێکردبوو [2].

لە دیارترین ئەو چالاکیە زانستی و ڕۆشنبیریانەی، کە لە لایەن دەسەلاتدار و پاشایانی (ئەییوبی) ئەنجامدراوە؛ دروست کردنی ناوەند و دامەزراوە زانستیەکان بوون، لە گرنگترینیشان دروست کردنی چەندین قوتابخانە و خانەی فەرموودەو خانەقا و بیمارستان بوو لەوانەش قوتابخانەی (العذراوية)[3] و (الظاهرية البرانية)[4] و چەندانی تر بوون [5]، بەتایبەتی خەڵکی (دیمشق) کێبرکێیان دەکرد لە دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و شوێنە زانستیەکان[6]، هەروەها لە هەوڵی بەردەوام دابوون بۆ ئەوەی ئەو قوتابخانەو ناوەندە زانستیانە داهات وهاوکاری

---

(١) ابن شداد، النوادر السلطانية ،ص٢٥٦.

(٢)ناصر محمد علي الحازمي, الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،ص٦٥.

(٣) قوتابخانەی (العذراوية): قوتابخانەی عەزراوییە لەلایەن (ست عذراء) ی کچی (شاهنشاه بن ايوب) لە شاری دیمەشق لەنێو دەرگای (النصر) دروست کراوە.النعيمي ، الدارس في تاريخ المدارس، تحقيق: إبراهيم شمس الدين, دار الكتب العلمية, (بيروت_١٩٩٠م)، ج١،ص٢٠٩.

(٤) قوتابخانەی (الظاهرية البرانية): ئەم قوتابخانەیە لە شاری دیمەشق لەلایەن مەلیك ( الظاهر غازي) كوری سولتان سەلاحەدینی ئەیوبی بونیات نراوە. النعيمي ، الدارس في تاريخ المدارس، ج١،ص٢٥٧.

(٥) ابن خلكان ، وفيات الاعيان ، ج٢،ص٤٥٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام ،ج١٣،ص٦٩؛ النعيمي النعيمي ، الدارس في تاريخ المدارس،ج١؛ ص ص٢٨٣،١٣٣.

(٦)ابن بطوطة ، رحلة ابن بطوطة (تحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار)، اكاديمية المملكة المغربية، ( الرباط-١٤١٧ هـ)، ص٢٣١.

بەردەوامیان هەبێت، بۆ ڕاپەراندن و بەجێهێنانی کاروبارەکانی خۆیان لە ئاستێکی باش[1].

تەنانەت لە سەردەمی (سەلاحەددین ئەیوبی) ئەوەندە گرنگی بە زانست وزانایان دراوە لەوماوە مێژوویەدا کردنەوەی قوتابخانە لە ولاتی (شام) ژمارەیان بەشێوەیەك زیاد بوو، کە جێگەی سەرنج بوو، هەروەکو (ئیبن جبیر)ی گەریدەناس لە ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) سەردانی ولاتی (شام)ی کردووە سەری سورماوە لەو ڕابوونە زانستیە و دڵخۆش بووە بە زۆری خانەی زانست و مزگەوت تێیدا، کە لەو میانەیدا پێی باشتر بووە لە هەموو ولاتانی ڕۆژهەلات بەگشتی، هەروەها سوڵتان پشتی بەست بە گەشەپێدانی ڕۆڵی خانەقا و پەناگەکان بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی خاچیەکان سوودی لێدەبینرا. (سەلاحەددین) ئەوپەری چاودێری و گرنگی پێدانی بەخشندانەی خستەسەر دامەزراوە ڕۆشنبیری و ئاینی و خزمەتگوزاریەکان [2].

زانایان لەسەردەمی (ئەییوبی)یەکان ڕێزیان ئەوەندە لەبەرچاو گیراوە بەڕادەیەك لەدەوڵەتدا چەندین کاری ئیداری وەکو وەزیرو دادوەر ومیرایەتیان پێسپێردراوە، بۆ نموونە هەریەکە لەوەزیر(ضیاء الدین) برای (ابن الاثیر)ی مێژوونوس و دادوەر(صدر الدین ابي القاسم الكردي)[3] ومیر(الفقيه عيسى الهكارى)[4]

---

(١) السبكي ، طبقات الشافعية الكبرى، ص٢٢٢.

(٢) احمد عبدالعزيز محمود، ستەم و نادادی دەرهەق بەسەرکردەی موجاهید سەلاحەددینی ئەیوبی ،وە: زرار علي، نوسینگەی تەفسیر، (هەولێر :٢٠١١ن)،ل ل٣١٣،٣٠٦.

(٣) قازی (صدر الدین): ناوی (صدرالدین ابی عبدالملك بن عیسی بن درباس الكردی) دادوەری دادوەران بووە، لە ساڵی (٥١٧ك) لە دایك بووە لە لایەن سولتان صلاح الدین ئەیوبی پۆستی قازی پێدراوە تاوەکو لە ساڵی (٦٠٥ك) کۆچی دوایی کردووە. المنذرى ، التكملة لوفيات النقلة ،تحقيق:بشار عواد ، ط٢، مؤسسة الرسالة، (بيروت-١٩٨٤) مج٢، ص١٥٦؛ الذهبي تاريخ الاسلام ،ج١٣،ص٦٥؛ السيوطى ، عبد الرحمن بن أبي بكرحسن، المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة , تحقيق: محمد ابو الفضل إبراهيم. دار إحياء الكتب العربية, (مصر-١٩٦٧ م),ج١، ص٤٠٨.

الهكاري)[1] ئەم پۆستانەیان وەرگرتووە، تەنانەت زانایان لە کۆڕو کۆبونەوەکانی فەرمانڕەوایانی (ئەیوبی)دا بەشداریان پێکراوەو پێگەی تایبەتیان هەبووە[2]. جینی زانایان جگە لەوەی ڕۆڵێکی زۆریان بینیوە لە بلاْوکردنەوەی زانستە جۆراوجۆرەکان، هەروەها ڕۆڵێکی کارایان بینیوە لە هاندان وبەشداری کردنی خەڵك بۆ تێکۆشان لە دژی خاچپەکان؛ تەنانەت شان بەشانی سوڵتان (صلاح الدین) و پاشایانی تری (ئەیوبی) بەشداریی جەنگەکانیان دەکرد، هەروەکو (ابن خلكان)ی مێژوونوس بەم شێوەیە ئاماژەی پێکردووە، کە چۆن زانایان بەشداریان لە ئازاد کردنی شاری (قودس) کردووە و خۆیان نەداوەتە دواوە :(( قصده العلماء من مصر والشام، بحيث لم يتخلف أحد منهم)) [3].

تێبینی ئەوە دەکرێ (ئەییوبی)یەکان گرنگی زۆریان داوە بە لایەنەکانی شارستانی، بەتایبەتی لایەنی ڕۆشنبیری، سەرەرای سەرقاڵی بەردەوامی (ئەیوبی)یەکان بەشەڕو جەنگەکانەوە؛ پاشایانی (ئەیوبی) لایەنی زانستی و

---

(١)(الفقيه عيسى الهكاري): ناوی (عيسى بن محمد بن عيسى بن محمد بن احمد) یەکێ بووە لە میرەکانی سەلاحی لە سەرەتادا خەریکی وتنەوەی زانستە شەرعیەکان بووە لە قوتابخانەیەکی حەلەب پاشان پەیوەندی بە میر ئەسەدەدین شێرکۆ کردووە ، ڕۆلی دیاری هەبووە لە وەرگرتنی پۆستی وەزارەت بۆ سولتان سەلاحەددین لە میسر بەرامبەر بەمەش سولتان زۆر ڕیزی لێوەرگرتووە و لە قسەی دەرنەچووە ، یەکێك بووە لە گرنگترین هاوڕێکانی سولتان سەلاحەددینی ئەیوبی ، لە ساڵی (٥٨٥ك) کۆچی دوایی کردووە. ابن الاثير ، التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية ، ص١٤٢؛ ابن خلكان ، وفيات الاعيان ،ج٣،ص٤٩٧؛ ابن حجر العسقلاني ، رفع الإصر عن قضاة مصر، تحقيق: علي محمد عمر, مكتبة الخانجي, (القاهرة-١٩٩٨), ص٢٩٤.

(٢) ابو شامة ،عيون الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: إبراهيم الزيبق, مؤسسة الرسالة, (بيروت-١٤١٨هـ/ ١٩٩٧م)، ج٤،ص٤٢٥؛ ابن خلكان ، وفيات الاعيان ،ج٥، ص ص٣٩٠_ ٣٩١،٣٩٧؛ الحسيني ،صلة التكملة لوفيات النقلة،ج١،ص١٢؛ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢،ص٨٦؛ الصفدي ، الوافي بالوفيات، ج١٩،ص٣٣١.

(٣) ابن خلكان ، وفيات الاعيان،ج٧، ص١٦٩.

ڕۆشنبیریان فەرامۆش نەکردووە و خۆیان نزیک کردۆتەوە لە چینی زانایان و ڕۆشنبیران، ئەمەش خاڵی هەرە بەهێزی شارستانیەتی (ئەیوبی)یەکان بووە، کە بەهۆیەوە توانیویانە زاڵ بن بەسەر هەموو ئەو هەڕەشەو بارودۆخە ناهەموارانەی ڕووبەروویانە دەبویەوە .

## دووەم: لایەنی کۆمەلأیەتی وڵاتی شام:-

بەشیوەیەکی گشتی ولأتی (شام) لەسەردەمی (ابن الصلاح الشهرزوری) چەند نەتەوەیەکی سەرەکی لە خۆ گرتبوو ئەوانیش بریتی بوون لە:-

**١- عەرەب:-**

بەشێك لە هۆزەکانی نەتەوەی عەرەب لە نیمچە دوورگەی عەرەبی کۆچیان کرد بۆ ولأتی (شام) لە پێشی هەمووشیانەوە، هەریەکە لە هۆزەکانی (بنو کلاب) و( بنو طي) و(بنو کلب) و(بنو عمار)و(بنو منقذ)... هتد. هۆزە عەرەبەکان بەشێك بوون لە سوپای (ئەییوبی)یەکان بەشداریان لە جەنگەکانی دژ بە خاچیەکان دەرکرد[١].

**٢- کورد:-**

یەکێکی تر لە پێکهاتەکانی تری ولأتی (شام) بریتی بوو لە نەتەوەی کورد، کوردەکان لە کاتی فەرمانڕەوایی (ئەییوبی)یەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ولاچتی (شام) دەرکەوتن؛ لەبەر ئەوەی دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئەییوبی) سوڵتان (سەلاحەددینی ئەییوبی) بە ڕەچەلەك کوردبووە و سەر بەهۆزی (ڕەوادیە)[٢]،

---

(١) محمود محمد الحويرى ، الاوضاع الحضارية في بلاد الشام، دار المعارف ( القاهرة :١٩٧٩م)،ص ص١٥_٢٠.

(٢) الرواديه ، تیرەیەکن لە هۆزی هەزبانی کوردی کە نیشتەجێی ناوچەکانی ئازەربایجان و هەولێر و جەزیرەی فوراتین . ابن خلكان ، وفيات الاعيان ، ج٧،ص١٣٩؛كرفان محمد احمد ، الكورد في كتابات المؤرخ ابن الاثير الجزرى ، اطروحة دكتوراه ، مقدمة الي كلية الاداب ،جامعة صلاح الدين ، (اربيل،٢٠٠٥) ص ص١٤٦_١٤٧.

هەربۆیەش کوردەکان بەشێکی سەرەکی سوپای (سەلاحەددینی ئەییوبی)یان پێك دەهێنا[1]. هەروەها لەماوەی دەسەڵاتداریەتی (ئەییوبی) لە(شام) و(میسر)دا؛ کۆمەڵێك لە زانای ناوداری کورد بە دەرکەوتن، کە بوونە پێشەنگ لە زۆرێك لە زانستە شەرعیەکاندا [2].

٣- تورك:-

پێکهاتیەکی تری دانیشتوانی وڵاتی (شام) و بەتایبەتی (دیمشق) بریتی بوون لە تورکەکان، هاتنیان بۆ وڵاتی شام دەگەڕێتەوە بۆ هاتنی تورکە سەلجوقیەکان بۆ ئەو ناوچەیە و زاڵ بوونیان بە سەر شاری (دیمشق) لە ساڵی (٤٦٨ك/١٠٧٥ز) [3]. دوای ئەوەی، کە تورکەکان ژمارەیان زیادکرد لە وڵاتی (شام) و بوونە خاوەن هێز و توانای دیار لە ڕووی سەربازی و چەندین دەسەڵاتدارو فەرمانڕەواییان دەرکەوتن، بێگومان کاریگەری و ڕۆڵی تورکەکان بەسەر کۆمەڵگەی(دیمشق) زۆر بە ڕوونی بەدیدەکرا لە زۆربەی بوارەکان [4].

٤-مەغاربیە:-

پێکهاتیەکی تر هەبوون، کە وەکو ئەوانەی تر زانیاری زۆریان لەسەر نیە، کە ڕۆڵ و بوونیان هەبووە لە ناو دەوڵەتی (ئەییوبی) و پاڵپشتی دەوڵەتی (سەلاحی) بوون لە وڵاتی (میسر)و (شام)و هەرێم و شارەکانی تری سەردەمی (سەلاحەددین ئەییوبی). مەغاربیەکان ئەوانەبوون، کە کاروباری ئەو کۆترانەیان بەڕیوە دەبرد، کە تایبەت بوون بە سوپای (سەلاحی)یەوە لەمیانەی گەمارۆی درێژی سەر (عەککا)،

---

(١) ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٩،ص٣٤٢؛ ابن خلكان ، وفيات الاعيان ،ج٧،ص١٤١.

(٢) الذهبي ،تاريخ الاسلام ،ج١٤،ص٥٥١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات ،ج١٩،ص٣٢٢.

(٣):ابن القلانسي ، تاريخ دمشق، تحقيق: سهيل زكار، دار حسان، (دمشق- ١٩٨٣م) ص ص١٨٢،١٧٤.

(٤)ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،ص٤٥.

كە نزیکەی دوو ساڵی خایاند[1] . مەغاریبەکان کەسانی لێهاتوو بوون؛ بەتایبەتی لە کایەکانی سوپای ئیسلامیدا، لە سەردەمی (سەلاحەددین ئەییوبی)؛ متمانەی تەواویان پێدراوە و ئەوانیش هاوکاری باش بوونە بۆ ئەو دەوڵەتە و دڵسۆزی زۆریان هەبووە بەتایبەت بۆ پیشەی سەربازی [2].

**دیاردەو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان:-**

کۆمەڵێك دیاردە و نەریتی کۆمەڵایەتی هەبوون لە کۆمەڵگەی (دیمشق)، پابەندبوون بە کاروبارە ئاینیەکان و زۆری مزگەوت و زانای بەناوبانگ و جێبەجێکردنی شەریعەت لە سیما دیارەکانی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا؛ هەندێ دیاردەی نادروست و خراپیش بەدی کراوە؛ وەك:- مەی خواردنەوە و بەرتیل و گۆرانی ناپەسەن،د هەر دەوڵەتی (ئەییوبی) ڕێگری دەکرد، بۆ ئەوەی ئەو جۆرە کارانە بەشیوەیەکی بەربڵاو لە ناو خەڵکی دا بڵاو نەبێتەوە [3].

یەکێك لەو نەریتە دیارانەی خەڵکی (دیمشق) بریتی بوو لەوەی، کە ڕۆژی عەرەفە (واتە ڕۆژی پیش جەژنی قوربان) ساڵانە لە کاتی عەسر لە مزگەوتەکان کۆدەبوونەوە تا ڕۆژئاوابوون دەمانەوە و دەستیان بەرزدەکردەو و نزایان دەکرد بەبۆنەی ئەو ڕۆژە پیرۆزەوە؛ کە حاجیەکان لەو ڕۆژە لەسەر چیای (عەرەفە) ڕاوەستاون و نزا دەکەن، بۆیە ئەوانیش ئەو ڕۆژە بەمشێوە کۆدەبوونەوە داوای لێخوشبوونیان دەکر لە پەروەدگار [4].

هەروەها نەریتێکی تری خەڵکی (دیمشق) ڕۆژانی شەممە کاریان نەدەکرد، بازارەکان دادەخران و نوسینگەو دیوان و تەنانەت ناوەندە زانستیەکانیش ڕادەوەستا، بەڵکو لەو ڕۆژەدا خەڵك دەردەچوون و سەردانی شوێنە خوشەکان و ڕووبار و

---

(١) المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، دار الكتب العلمية العلمية ، (بيروت- ١٩٩٧م) ج١،ص٩٤.

(٢)احمد عبدالعزيز محمود ، ستەم و نادادی ، ل١٣٠.

(٣)ناصر محمد علي الحازمي, الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،ص٤٩.

(٤) ابن جبير ، رحلة ابن جبير، دار ومكتبة الهلال، (بيروت-د.س)ص٢٣٨

بێستانەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی، کاتێکی خوش بەسەر ببەن تا شەو دەمانەوە[1]. ئەریتێکی تر؛ کە زۆر گرنگ بوو، لە مانگی ڕەمەزان خەڵك و دەسەلاتدارو گەورە پیاوانی(دیمشق) خوانی (الإفطار) گشتیان سازکردووە بۆ هەژاران و کەمدەرامەتان، ئەمەش لە لایەن خەڵکی دەوڵەندو بازرگانەکان ڕێکخراوەو سەرپەرشتی کراوە[2].

**سێیەم: لایەنی ئابووری وڵاتی شام :-**

دوای جێگیربوونی دەسەلاتی (ئەییوبی)یەکان لە ولاتی (شام) بەتایبەتی لەسەردەمی (سەلاحەددینی ئەییوبی) گرنگی زۆری درا بە بوژاندنەوەی بواری ئابووری، بەتایبەتی شاری (دیمشق)، کە چالاکی گەورەی لەو ڕووەوە بەخۆیەوە بینی لەوانەش:-

**کشتوکاڵ:-**

کشتوکاڵ کردن بەهەموو جۆرەکانی لە ولاتی (شام) گرنگی زۆری هەبووە، هۆکاری سەرەکی گەشەکردنی کشتوکاڵ لە ولاتی (شام) زۆری ئاوی ڕووبارەکان بوو، هەروەها لە (دیمەشق) سەرچاوەی سەرەکی ئاوی باران بوو بۆ کشتوکال، گرنگیدانی زیاتر بەم بوارە لەسەردەمی (سەلاحەددینی ئەییوبی) دەرکەوت؛ کاتێك، کە جوتیاران بارودۆخیان شپرزە ببوو لە (میسر)و ولاتی (شام) بەهۆی هەندێ کیشەوە بەتایبەتی لافاوی نیل بەمەش (سەلاحەددینی ئەییوبی) بڕیاری ڕاگرتنی باج و سەرانەی دا، لەسەر جوتیار و هەژارەکان[3] .

(١) ابن بطوطة ، رحلة ابن بطوطة ص٣٠١.

(٢)ابن بطوطة، رحلة ابن بطوطة ،ص٣٣١ .

(٣)احمد عبدالعزيز محمود ، ستةم و نادادی ، ل٢٩١.

لە (دیمەشق) چەدین ڕێگای كشتوكاڵیان بەكاردەهێناو؛ گرنگی زۆریان بە سەوزایی و جۆرەكانی میوە دەدا، بەتایبەتی ترێ و سێو هەنارو گێزەرو خۆخ و چەندان میوەی تر؛ كە وڵاتی (شام) بەناوبانگ بووە لەو جۆرە بەروبومانە [١].

**پیشەسازی: -**

وڵاتی (شام) بە گشتی شاری (دیمەشق) بەتایبەتی یەكێك بووە لە شارە بەناوبانگەكان لە بواری پیشەسازیە جۆراوجۆرەكان لە ناوچەكە و جیهانی ئیسلامی [٢]؛ بە هۆی بوونی كەرستەی گرنگ و جۆرەها كانزا، لە ناوچەكانی وڵاتی (شام) ئەمە وای كرد لە ڕووی پیشەسازیەوە ئەو ناوچەیە بەرەو پێش چوونی بەرچاو بەخۆیەوە ببینێ، لەوانەش بەكاهێنانی مس لە دروست كردنی دەرگاو پەنجەرە و شتی تر [٣].

زۆر پیشەسازی تر لە وڵاتی (شام) بوونی هەبوو، لەوانەش پیشەسازی شیرو تیر، كە لە (دیمەشق) هەبوو، بە بەهێزی بەناوبانگ بوو، هەروەها پیشەسازی قوماش، كە چەندەها جۆر قوماش دروست دەكرا؛ قوماشی (دیمەشق)ی زۆر بەناوبانگ بوو، یەكێكی تر لەو پیشەسازیە گرنگانەی، كە لە وڵاتی (شام) بەتایبەتی لە (دیمەشق) گرنگی زۆری هەبوو پیشەسازی پەڕاو(الورق) بوو، كە كارگەی تایبەت هەبوو بە دروستكردنی پەڕاو، كە بۆ زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامی و شوینەكانی تر ڕەوانە دەركرا و دواتر گوازریەوە بۆ وڵاتانی ئەوروپا [٤]. هەروەها پیشەسازی گوڵ یەكێكی

(١) القلقشندي ، صبح الأعشى في صناعة الإنشاء، دار الكتب العلمية، (بيروت-د.س) ، ج٤، ص ص٨٦_٨٧.

(٢) ابن فضل الله العمري، مسالك الأبصار في ممالك الأمصار, المجمع الثقافي , (ابو ظبي- ١٤٢٣ هـ), ج٥, ص٦٧٩

(٣) الغزي ، نهر الذهب في تاريخ حلب،دار القلم،(حلب، ١٤١٩هـ)، ص١٠٣.

(٤) محمد كرد علي, خطط الشام، مكتبة النوري, (دمشق- ١٩٨٣ م), ج٢، ص١٢٤.

تر بوو لەو پیشەسازیانەی؛ کە خەلکی (دیمەشق) پێوەی خەریك بوون، تەنانەت توانیویانە بازرگانی بە بەرهەمەکانی گوڵ بکەن و هەناردەی هەریەکە لە ناوچەکانی (حیجاز)و (یەمەن)و (سند)و (هند)و (چین)ی بکەن [1].

**بازرگانی:-**

بازرگانی لە ولاتی (شام) لە سەردەمی (ئەییوبی)یەکان گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینی؛ بەتایبەتی لە شاری (دیمەشق)، لەسەردەمی (ئەییوبی)یەکان ئالوگۆرکردنی بازرگانی لە نێوان (دیمەشق)و میرنشینە خاچیەکان لە(شام) ئەنجام دەدرا، بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییە بازرگانیەکان لەنێوان (شام) بۆ (میسر)و بەپێچەوانەوەش و هەروەها (شام) بۆ ناوچە خاچیەکان گەشەسەندنی گەورەی بەخۆیەوە بینی، تەنانەت ئەو ململانێیە سیاسی و سەربازییانەی، کە لە نێوان (ئەییوبیی)و خاچیەکاندا هەبوو؛ نەبووە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم ئالوگۆڕە بازرگانیەکان، جگە لەمە دەوڵەتی (ئەییوبی) بە شێوەیەکی فەرمی ڕێککەوتننامەی بازرگانی لەگەڵ فەرەنجەکان مۆرکردبوو؛ ئەمەش بووە هۆی کار ئاسانی بۆ کاروانە بازرگانیەکانی هەردوولا؛ هەروەکو ولاتناس (ابن جبیر) لە گەشتەکەی ئاماژەی پێکردووە و دەڵێت:- (( واختلاف القوافل من مصر الى دمشق على بلاد الافرنج غير منقطع. واختلاف المسلمين من دمشق الى عكة كذلك. وتجار النصارى ايضا لا يمنع أحد منهم ولا يعترض. وللنصارى على المسلمين ضريبة يؤدونها في بلادهم، وهي من الامنة على غاية. وتجار النصارى أيضا يؤدون في بلاد المسلمين على سلعهم، والاتفاق بينهم والاعتدال في جميع الأحوال. وأهل الحرب مشتغلون بحربهم، والناس في عافية، والدنيا لمن غلب )) [2] .

گەشەسەندنی ئابووری لە ولاتی(شام) کاردانەوەی ئەرێنی باشی بینی، لەسەر بووژانەوەی لایەنی ئاوەدانی، تەنانەت بووە هۆی دروست کردنی چەندین

(١) ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،ص٣٦.

(٢) رحله ابن جبير ،ص٢٣٥.

دامەزراوەی ڕۆشنبیری و زانستی وەکو:- قوتابخانەو خانەی فەرموودەو بیمارستان وپەناگەو... هتد، لەم ناوچەیەدا[1].

# بەشی یەکەم

# ژیاننامەی ( ابن الصلاح )

**تەوەرەی یەکەم:ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی.**

**تەوەرەی دووەم: لە دایك بوونی ( ابن الصلاح ).**

**تەوەرەی سێ یەم: خانەوادەی ( ابن الصلاح ).**

**تەوەرەی چوارەم: پێگەیشتن و گەورەبوونی**

(١)ابن خلكان ، وفيات الاعيان ، ج٢،ص٤٥٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام ،ج١٣،ص٦٩؛ النعيمي ، الدارس في تاريخ المدارس،ج١، ص ص١٣٣،٢٨٣.

## بەشی یەکەم:- ژیاننامەی (ابن الصلاح الشهرزوری):-

### تەوەرەی یەکەم:- ناو و نازناو و ڕەچەڵەکی:-

ناوی تەواوی (أبو عمرو عثمان بن عبد الرحمن بن عثمان [١] بن موسى بن أبي نصر [٢] النصري [٣] الكردي [٤] الشهرزوري [٥] الدمشقي [٦] الشافعي [٧] الموصلي) [٨] یە.

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان وانباء ابناء الزمان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, تحقيق: احمد الأرناؤوط وتركي مصطفى, دار إحياء التراث, (بيروت_٢٠٠٠م) ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, تحقيق: د. محمود محمد الطناحي د. عبد الفتاح محمد الحلو, : هجر للطباعة والنشر والتوزيع(د.م- ١٤١٣هـ), ج٨, ص١٧٥؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, تحقيق: إبراهيم شمس الدين, دار الكتب العلمية, (بيروت_١٩٩٠م), ج١, ص١٦.

(٢) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ الاسنوي, طبقات الشافعية, تحقيق: عبدالله الجبوري, مطبعة الارشاد, (بغداد-١٩٧١), ج٢, ص١٣٣؛ ابن قاضى الشهبة, طبقات الشافعية, تحقيق: د. الحافظ عبد العليم خان, (بيروت-١٤٠٧), ج٢, ص١١٣؛ السيوطي, طبقات الحفاظ, (بيروت-١٤٠٣), ص٥٠٣.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩.

(٤) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, تحقيق:نورالدين عتر, ط٣, دارالفكر, (دمشق-٢٠٠٦), مقدمة المحقق, ص٧؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان , ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛.

(٥) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص ٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ اميد ابراهيم جوزەلی, تقى الدين ابن الصلاح الشهرزورى, مجلة زانكو, (اربيل-١٩٩٧), ص٢٥٨.

(٦) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(٧) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٧ ؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن العماد, شذرات الذهب, تحقيق: محمود الأرناؤوط , دار ابن كثير, (بيروت-١٩٨٦), ج٧, ص٣٨٣.

(٨) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٣٨٣.

سەبارەت بە نازناوەکانی (ابن الصلاح الشهرزوری)؛ کە لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ پێکراوە، دەتوانیین بڵێی، بە چەندیین شێوە هاتووە، کە هەریەك لەو نازناوانە گوزارشتن لە پێگە و لێهاتوویی و گەورەیی ئەم زانایە؛ لە بوارەکانی زانستی و ڕۆشنبیری و هزریــدا، لە گرنگترین ئەم نازناوانەش بە( ابن الصلاح ) هاتووە[1]، هەروەها بە نازناوی ( الشافعی)[2]هاتووە، هەروەها ئاماژە بەوە دەکرێ، کە لە هەندێ سەرچاوە بە (الموصلی) [3]یش ناوی هاتووە، هەروەها نازناوێکی تری بریتی بووە لە (الشهرزوری)[4]، بەلاّم لە سەرچاوەکان زۆرتر بە نازناوی (تقی الدین ابن الصلاح) ناسراوە[5].

---

(١) ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة, دار الكتب, (مصر -د.ت), ج٦, ص٢٨٠؛ ابن العراقي, تحفة التحصيل في ذكر رواة المراسيل, تحقيق: عبد الله نوارة, مكتبة الرشد, (الرياض-د.ت), ص٤٩؛ المقريزي, إمتاع الأسماع بما للنبي من الأحوال والأموال والحفدة والمتاع, تحقيق: محمد عبد الحميد النميسي, دار الكتب العلمية, (بيروت-١٩٩٩م), ج١٣, ص٢٦؛ المكي, سمط النجوم العوالى فى انباء الاوائل والتوالى, تحقيق:عادل احمد واخرون, دار الكتب العلمية, (بيروت- ١٩٩٨), ج٢, ص١٦٩؛ عمر بن رضا بن محمد بن راغب بن عبدالغنى, معجم المؤلفين, (بيروت-د.ت), ج٦, ص٢٥٧.

(٢) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن ابن حجر العسقلاني, النكت على كتاب ابن الصلاح, تحقيق: ربيع بن هادي عمير المدخلي, عمادة البحث العلمي بالجامعة الإسلامية, (المدينة المنورة-١٩٨٤), ص٩ ؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٣٨٣.

(٣) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٣٨٣.

(٤) (شهرزور): ناوچەیەکی فراوان و گەورەیە دەکەوێتە نێوان هەولێر و همدان و دانیشتوانەکەی هەمووی کوردن کە بنیادنراوە لە لایەن (زور بن الضحاك). ياقوت الحموي, معجم البلدان, دار صادر, (بيروت-١٩٩٥), ج٣, ص٣٧٥؛ صفي الدين, مراصد الاطلاع على اسماء الأمكنة والبقاع, دار الجيل, (بيروت-١٤١٢هـ), ج٢, ص٨٢٢؛ السيوطي, لب اللباب فى تحريرالانساب, (بيروت-د.ت), ص١٥٨.

(٥) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٧؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ اليونيني, ذيل مرآة الزمان, ط٣, دار الكتاب الإسلامي, (القاهرة-

سەبارەت بە ڕەچەلەکی (ابن الصلاح) میژوونووسان توانیویانە بنەچەی ئەم زانایە بە ڕوونی دەربخەن، هیچ لێلییەك نەهێڵنەوە، کە ببێتە مایەی جیاوازی و گرفت لەسەر ڕەسەنیەتی و دروستی بنەماڵەکەی، کە دەگەڕێتەوە سەر نەتەوەی کورد؛ بۆیە لە هەندێ سەرچاوەکان بە (الکردی)ناوی هاتووە[1].

هەروەها ئەو شوێنەی، کە (ابن الصلاح) تیایدا لە دایك بووە؛ ڕەچەلەك و بنەچەی ئەو بۆ ناوچەیە دەگەڕێتەوە، کە ئەویش گوندیکە بە ناوی (شرخان) لە ئێستادا بە (شیلە خان) ناسراوە، سەر بە (شارەزوور) بووە و لە نزیك (هەولێر) کە دانیشتوانەکەی کوردبوونە، بۆیە لە سەرچاوەکان نازناوی (الشرخانی) هاتووە [2].

هەروەها نازناوی (الشهرزوری)یشی وەرگرتوو[3]؛ هەروەکو (ابن خلکان) بەم شێوە باسی کردووە((أبو عمرو عثمان بن عبد الرحمن بن عثمان بن موسى بن أبي نصر النصري الكردي الشهرزوري المعروف بابن الصلاح، الشرخاني))[1].

---

١٩٩٢)، ص١٩٣؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٨، ص ١٧٥؛ ابن كثير، طبقات الشافعية، تحقيق: د أحمد عمر هاشم، د محمد زينهم محمد عزب، (مكتبة الثقافة الدينية-١٩٩٣)، ج١، ص٨٥٤؛ ابن الملقن، تذكرة المحتاج إلى احاديث المنهاج، تحقيق: حمدي عبد المجيد السلفي، المكتب الإسلامي، (بيروت- ١٩٩٤)، ج١، ص١٢؛ ابن حجر العسقلاني، النكت على كتاب ابن الصلاح، ص٩؛ ابن العماد، شذرات الذهب، ج٧، ص٣٨٣.

(١) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٠٩؛ ابن حجر العسقلاني، النكت على كتاب ابن الصلاح، ص٩؛ کاوە، ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسلمانەکان، ل ٢٠٩.

(٢) ابن الصلاح، معرفة انواع علوم الحديث، مقدمة المحقق، ص٧؛ ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٠٩؛ ابن حجر العسقلاني، النكت على كتاب ابن الصلاح، ص٩؛ کاوە، ڕۆڵی پرشنگداری زانا، ل ٢٠٩.

(٣) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٤٤؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٩٦؛ ابن حجر العسقلاني، النكت على كتاب ابن الصلاح، ص٩؛ قادرمحمدحسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، مطبعة الحاج

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە بنەچەی ئەم زاناو کەڵەپیاوە لە نەتەوەی کوردەو لە کوردستان لە دایك بووە، لە بنەماڵەیەکی ناوداری (شارەزوور) بوونە و خاوەن پێگەیەکی زانستی گەورەبوونە. دیارە سەرجەمی مێژوونوسان ئەو ڕاستیەیان دووپات کردۆتەوەو هیچ جۆرە نکۆڵیەکیان نەکردووەو بە ڕوونی لە نووسینە مێژووییەکانیاندا ئاماژەیان پێکردووە .

## تەوەرەی دووەم :- لەدایك بوونی ( ابن الصلاح الشهرزوري ) :-

سەبارەت بە ساڵی لە دایك بوونی و شوێنی لە دایك بوونی، کۆمەڵێك ڕای جیاواز هەیە، بەڵام زۆربەی زۆری میژوونوسان لەسەر ئەوە کۆك و هاودەنگن؛ کە (ابن الصلاح الشهرزوري) لە ساڵی (٥٧٧ك/١١٨١ز) (٢) لە گوندی (شرخان) لە دایك بووە[٢]، ئەوەی جێی سەرنجە، کە لە سەرچاوە سەرەکیەکان؛ بە تایبەتی قوتابیەکانی تەنها (ابن خلكان) زۆر بە ڕوونی باس لەوە دەکات لە (شرخان) هاتۆتە دونیا[٤].

---

هاشم, (اربيل-٢٠٠٩) ص٢٢٩؛ بابەشێخی مەردۆخی, مێژووی ناودارانی کورد, و:ماجدی مەردۆخ, (هەولێر-٢٠١١), ب١, ل٨٧.

(١) وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٢) ابن الصلاح ؛ ادب المفتي والمستفتي, تحقيق:موفق عبدالله عبدالقادر, (المدينة المنورة-١٤٣٢), ص١١؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان، ج٣, ص٢٤٤؛ ابو الحجاج, تهذيب الكمال في الاسماء الرجال, تحقيق:بشار عواد معروف, (بيروت-١٩٨٠), ص٢٢؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, دار الحديث, (القاهرة-٢٠٠٦م) ج١٦, ص٣٦٠؛ الذهبي, تذكرة الحفاظ, دار الكتب العلمية, (بيروت ١٩٩٨م), ج٤, ص١.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٤) وفيات الأعيان, ج٣, ص ص٢٤٥،٢٤٣.

هەروەها هەندێ لە سەرچاوەكان كاتێك باس لە شوێنی لە دایك بوونی دەكەن، دەڵێن:- (ابن الصلاح الشهرزوري)لە ناوچەی (شارەزوور) لە دایك بووە[1]، بەلام هەندێ لە مێژوونوسان بۆچوونی تریان هەیە لەسەر ساڵی لەدایك بوونی، لەوانەش (الصفدی)، كە پێی وایە (ابن الصلاح) لە ساڵی (٥٩٧ك/ ١١٨١ز) لە دایك بوو[2]، بەلام بەهێزترین بۆچوون لەو بارەوە ڕای یەكەمە؛ چونكە مێژوونووس (ابن خلكان) (م:٦٨١ك/١٢٨٢ز)، كە قوتابی ئەو بووە، هەروەها كتێبەكەشی بەسەرچاوەیەكی گرنگ و سەرەكی و متمانەپێكراو دادەنرێت لەمەڕ ساڵی لەدایك بوون و مردنی، كە ئەو ئاماژەی پێكردووە، كە (ابن الصلاح الشهرزوري) لە (٥٧٧ك/١١٨١ز) لە دایك بووە[3].

## تەوەرەی سێ یەم:- خانەوادەی (ابن الصلاح الشهرزوري):-

ئەگەر بمانەوێ لەسەر خانەوادەو خێزانی (ابن الصلاح) زانیاریمان دەست كەوێ و ئاشنایان بین، ئەوە لەڕاستی دا شتێكی ئەوتۆ نییە لە سەرچاوەكان؛ كە باسی سەرجەم كەس و كار و خانەوادەی (ابن الصلاح ) بكات، (واتە زانیاری تەواو لەبەر دەستدانیە تا بە ووردی باسیان لێوە بكەین)، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆكارێك، یەكێك لەو هۆكارانە نەنووسینەوەو ئاماژە نەكردنی مێژنووسانە بە خانەوادەكەی، وەهەروەها (ابن الصلاح) خۆشی دیارە باسی لە خانەوادەكەی بە ووردی نەكردووە؛ بۆیە ئاسان نییە زانیاری وەدەست بینین لەسەر دایك و براو

---

(١) الحافظ العراقي, شرح التبصرة والتذكرة, تحقيق: ماهر ياسين, (د.م-د.ت), ص٢٥٨؛ عبد الرحمن بن محمد, الأنس الجليل بتاريخ القدس والخليل, تحقيق: عدنان يونس عبد المجيد نباتة, مكتبة دنديس, (عمان-د.س), ج٢, ص١٠٤.

(٢) الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الابناسي, الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح, صلاح فتحي هلل, (مكتبة الرشد- ١٤١٨), ج١, ص٦٤؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, تحقيق: إبراهيم شمس الدين, دار الكتب العلمية, (بيروت -١٩٩٠م), ج١, ص١٦؛ اميد ابراهيم جوزەلی, تقی الدين ابن الصلاح الشهرزوري, ص٢٥٨.

خوشك و تەواوی خانەوادەکەی، بەلام باس لە باوك وباپیری کراوە، کە کە خاوەن پێگەیەکی کۆمەلایەتی و زانستی و تێگەیشتنی باش و گرنگ بوونە، چەندین نازناویان وەرگرتووە و باوکی وەکو شێخێکی گەورە سەیر کراوە، هەر بۆیە بە نازناوی (صلاح الدین)یش[1] هاتووە، هەروەها باپیری بە (الامام العلامة)ش[2] بەناوبانگ بووە، بۆیە باوکی (ابن الصلاح الشهرزوری) رۆڵ و پێگەی بەرچاوی هەبووە، هەروەها خاوەن ناوبانگی گەورە بووە لەو سەردەمدا لە ناوچەکەدا، هەروەها یەکەم ماموستای (ابن الصلاح الشهرزوری )بووە، کە کتێبی (المهذب)ی[3] پێ دەڵێت و گرنگی پێدەدات؛ چونکە خۆی شارەزایی لە (الفقه)دا هەبووە[4].

**باوکی:-**

ناوی تەواوی (عبد الرحمن بن عثمان[5]بن موسى بن أبي نصر)[1] (النصري)[2]، وە هەروەها دیارە چەندین نازناوی تری گرنگی هەبووە یەکێك لەو نازناوانەی، کە

---

(١) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛النعيمي, الدارس,ج١, ص١٦؛ ابن كثير, البداية والنهاية,ج١٣, ص١٩٦.

(٢) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص١٦.

(٣) کتێبی( المهذب ): کتێبێکی گرنگی فیقهیە لەلایەن ئیمام (ابي اسحق ابراهيم بن على بن يوسف الشيرازي ) نووسراوەتەوە کەتیایدا بەشێوەیەکی جوان شەرحی فقهی ئیمامی شافیعی کردووە. النووي ، روضة الطالبين وعمدة المفتين ،تحقيق: زهير الشاويش، المكتب الاسلامي، (بيروت -١٩٩١) ج٢،ص٣٩٠؛ جمال الدين ابو محمد علي بن ابي يحيى زكريا الخزرجي المنبجي، اللباب في الجمع بين السنة والكتاب ،تحقيق:محمد فضل عبد العزيز المراد ، دار القلم (بيروت-١٩٩٤)، ج١،ص٢٥١" الصنعاني، توضيح الافكار المعاني تنقيح الانظار, تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، مكتبة السلفية، (مدينة منورة, د.س)، ج١، ص٢٣٢.

(٤) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٣٥٤.

(٥) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

باوكی (ابن صلاح) زۆر پێوەی ناسرابوو بریتی بوو (المفتي صلاح الدين ابو القاسم)[٢] (الكردی)[٤]، هەروەها بە (الشهرزوری)[٥] (الشافعی)[٦](الموصلی)[٧]، جگە لەوەی بەنازناوی (الشرخانی) هاتووە[٨] .

هەروەها لەسەر لەدایك بوونی باوكی (ابن الصلاح الشهرزری) زۆربەی سەرچاوەكان بەدروستی ئاماژە بەوە ناكەن؛ كە بە دڵنیایەوە ساڵی چەند لە دایك بووە، بەلأم بە نزیكەیی باسكراوە، كە لە ساڵی(٥٣٩ك/١١٤٤ز) لەدایك بووە

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩.

(٢) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(٣) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(٤) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٧؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ كاوە, رۆڵی برشنكداری زانا موسلمانەكان لە پێشكەوتنە زانستیەكاندا, كومبانیای چاب و پەخشی سەردەم, ٢٠٠٧, ب١, ل ٢٠٩.

(٥) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦,

(٦) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٧؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن العماد, شذرات الذهب, تحقيق: محمود الأرناؤوط, دار ابن كثير, (بيروت-١٩٨٦), ج٧, ص٣٨٣.

(٧) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٣٨٣.

(٨) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٧؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابو الفداء, الثقات ممن لم يقع في الكتب الستة, ج٧, ص٩١؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن حجر العسقلاني, النكت على كتاب ابن الصلاح, ص٩.

(عبدالرحمن بن عثمان ابوالقاسم) [1]، بەلام (الـذهبي) دەڵێـت:- ((لـە پـێش ساڵی (٥٤٠ك/١١٤٥ز) لە دایك بووە))[2].

دیارە یەکێك بووە لە زاناو کەسایەتییە دیارە کوردیەکان ((كان من جلة مشايخ الأكراد المشار إليهم))[3]، سەرەتای وەرگرتنی زانستی (الفقـه) لای چەند زانایەك بەناوبانگ بووە، یەکێك لەو زانا ناودارو بەناوبانگانە (شـرف الـدين بـن أبـي عصرون)بووە [4].

هەروەها پاش ئەوەی، کە زانست و زانیاری زۆر وەردەگری و دواتر لە (حلب) نیشتەجێ دەبێت و جێگیر دەبێت[5]، دوای ئەوەی شارەزاییێکی زۆر وەردەگرێ و قووڵ دەبێتەوە لە وەرگرتنی زانیاری، لە زانستە ئاینیەکان بەتایبەت لە بواری (الفقـه)، دەست دەکات بە گوتنەوەی وانە لە قوتابخانە و ناوەندە زانستی و ڕۆشنبیریەکان و دەبێتە ماموستا لە قوتابخانەی(الاسـديه)[6] لە (حەلەب)و خزمەتێکی گرنگ و بەرچاو پێشکەش دەکات و دەبێتە جێی بایەخی زۆرێك لە فێرخوازان و قوتابیان، کە بەمەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری ڕوویان تێکردووە[7]. بەم شێوە ئەوەی تێبینی دەکری، کە (ابـو القاسم) دەکرێ بڵێین بە قوتابخانەو (مرجع) ێکی گەورە دادەنرێت لە پێگەیاندن و تێگەیاندنی کوڕەکەی

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص ص٢٤٤-٢٤٥؛ الزركلي, الاعلام, ج٤, ص٢٠٧.

(٢) تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٤) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩.

(٥) الصـفدي, الـوافي بالوفيـات, ج١٨, ص١٠٩؛ السـبكي, طبقـات الشـافعية الكـبرى, ج٨, ص١٧٥.

(٦)قوتابخانەی (الاسدية) ئەم قوتابخانە لە لایەن اسدالدين شيركوى مامی سەلاحەددینی ئەیوبە بنیاتنراوە, کە یەکێك بووە لە سەرکردەکانی نورالدين محمود, لەساڵی (٥٦٤ك) وەفاتی کردووە. النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص١٦.

(٧) الـذهبي, تـاريخ الاسـلام, ج١٣, ص٥٤٤؛ الصـفدي, الـوافي بالوفيـات, ج١٨, ص١٠٩؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛ كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(ابـن الصلاح الشهرزورى)؛ لەبەرئـەوەى ئـەو خـۆى كەسـێك بـووە لـە نـاو كەشـێكى زانسـتى و هـزرى گـرنگ بـووە، بۆيـە هـەر لـە سـەرەتاوە ويسـتويەتى بـە هـەموو شـێوەيەك زەمينەسـازى بـۆ كورِەكـەى بكـات، چ لـە رِووى پـەروەردەكردن و چ لـە رِووى دەستنيشـانكردنى مامۆسـتاكانى و پێـدانى شـارەزايى گـرنگ لـە بـوارى مامەڵەكردن و گەرِان بە دواى زانست و زانيارى و ئـەزموونى پرِبايـەخ و جوان، كە لەدواتر بۆ (ابـن الصـلاح )بوونـە پاشخان و بناغەيـەكى پتـە و گـرنگ لـە بنياتنـانى كەسايەتى و بەرەوپێش چوونى لە بوارى پەروەردەيى و زانستى و هزريدا[1].

هـەروەها لەسـەر مردنـى (عبـدالرحمن بـن عثمـان صـلاح الـدين ابـو القاسـم) مێژوونوسان كۆك و هاورِان لـە سـەر سـاڵى ماڵئـاوايى كردنـى يـەكجارى بـاوكى (ابـن الصلاح الشهرزورى)، ديـارە دواى ماوەيـەكى زۆر لـە هەوڵدان و بەخشـين دواجـار لـە شــەوى پێــنج شــەممە لــە (٢٧)ى (ذى القعــدة)، [2] لەســاڵى (٦١٨ك/١٢٢١ز) (٣)، لــە (حەلەب) كۆچى دوايى كردووە [4]؛ لە دەرەوەى(باب الأربعين) بە خاكسپێردرا [5].

بـەم شـێوە دواى نزيكـەى هەشـتا سـاڵ لـە تەمـەنى پـرِ لـە بەرەكـەت و هيمـمـەت بەرزى و هەوڵدان و تێكۆشان و گەرِان و پێگەيانـدنى چـەندين قوتـابى و بەخشـينى زانسـتێكى زۆر، دواجـار تەمـەنى كۆتـايى هـات و گيـانى چـووە بـەر دلۆڤـانى خـواى پەروەردگار .

---

(١) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ ابراهيم احمد شوان (ابن الصلاح الشهرزوري)، الشهرزوري)، گۆفارى كاروان، ل١١.

(٢) ابـن خلكـان، وفيـات الأعيـان، ج٣، ص٢٤٤؛ السـبكي، طبقـات الشـافعية الكـبرى، ج٨، ص١٧٥.

(٣) الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٣، ص٥٤٤؛ الصـفدي، الـوافي بالوفيـات، ج١٨، ص١٠٩؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٨، ص١٧٥.

(٤) الصـفدي، الـوافي بالوفيـات، ج١٨، ص١٠٩؛ السـبكي، طبقـات الشـافعية الكـبرى، ج٨، ص١٧٥.

(٥) ابن خلكــان، وفيــات الأعيـان، ج٣، ص٢٤٤.

## تەوەرەی چوارەم:- پێگەیشتن و گەورەبوونی (ابن الصلاح ):-

پێگەیشتن و گەشەکردنی (ابن الصلاح) لەسەردەم و بارودۆخێکی تایبەتی دا بوو، دەسپێکی کشانی مەغۆل و سەرهەڵدانی دەوڵەتی (ئەییوبی) بوو، لە ناوچەکەدا، ئەو لە بنەماڵەیەکی زانستخوازو دیندارو بەناوبانگ پەروەردەبوو، یەکەم قوتابخانە کە تیایدا گەشەدەکات و دەچێتە نێو جیهانی زانستی و ڕۆشنبیری خێزان و خانەوەدەکەی خۆی بووە، سەرەتای وەرگرتنی زانست و زانیاریەکانی لە (شارەزوور) لای باوکی (ابو القاسم الشهرزوری)[1]، وەردەگرێ، کە ئەو کات زاناو کەسایەتیەکی دیارو بەرچاوی ناوچەکە بووە [2] .

هەروەها دوای ئەوەی، کە باوکی هەستی بەوە کرد، کە ئەو گوندە بچووکە لە ئاست لێهاتوویی و پێگەیشتنی ئەودا وەکو پێویست نییە و ناتوانێ ئەو ئامانج و مەبەست و خەونانەی هەیەتی پێیی بگات، بۆیە لە پێناو برەودان بە توانا و لێهاتنەکانی و گەیشتن بە ئاستێکی گەورەی پلەی زانستی، (ابن الصلاح) دەستی کرد بە گەڕان و گەشتێکی بەرفراوانی زانستی بە جیهانی ئیسلامی؛ بە مەبەستی وەدەستخستنی زۆرترین زانست و زانیاری لە ناوچە جیاجیاکان [3].

(ابن الصلاح الشهرزوری) هێشتا سەروڕیشی تەواو نەهاتبوو، واتە تەمەنی بچووك بووە، کتێبی (المهذب) هەمووی لای باوکی خوێندووە[4]، وە لە یەکەم

---

(١) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٤٤؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٠٩؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٨، ص١٧٥؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص١٦؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص١٩٦

(٢) ابن الصلاح، علوم الحديث، ص٧؛ ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج٢٣، ص١٤٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦؛ احمد محمود الخليل، مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا، و:زرار عەلی، چاپخانەی بەیوەند، (سلێمانی-٢٠١١) چ٢، ص٣٧٣؛ ابراهیم ئەحمەد شوان، (ابن صلاح الشهرزوری)، گۆڤاری کاروان، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ل١١.

(٣) امید ابراهیم جوزەلی، تقی الدین ابن الصلاح الشهرزوری، ص٢٥٨.

(٤) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦.

هـەنگاونانی و دەسـپێکی گەڕانـەکانی بڕیاریانـدا ڕو لـە (موسـل) بکـەن، کـە بـاوکی بەمەبەستی وەرگرتنی زانست ڕەوانەی کرد [1]؛ ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت، کـە ئـەو کات (موسڵ) خاوەن پێگەیەکی زانستی و ڕۆشنبیری گرنگ و گەورە بووە، بـۆ ئـەو کەسانەی، کە خەریکی گەڕان بوونە بە دوای زانست و زانیاری، ئەوکات (ابن الصلاح) دەچێتە لای زاناو کەسایەتی ناوداری موسل (شـیخ عماد الـدین بـن ابی حامـد ابـن یـونس)[2]، لای ئـەو زانـا نـاودارە دووبـارە کتێبـی (المهـذب) بـە تـەواوی دەخـوێنێ و شارەزایی زۆر وەردەگرێ.

(ابـن الصـلاح) ماوەیـەك ماوەتـەوە لـە (موسـل) ئـەو ماوەیـە زور نـەبووە[3] وە دیـارە لـەو ماوەیـدا چـۆتە لای کۆمـەڵێك ماموسـتا و زانـا بـەناوبانگ و زانسـتی لێوەرگرتوون؛ لە بواری (الفقه)[4]، الحدیث[5]، الاصول[6]، التفسیر[7] لەوانەش لە بواری

---

(١) الذهبي, سير أعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤٠؛ محمد امين زكي, مشاهير الكرد, , ت:سانحة زكـي بـك, ط٢, دار الزمـان, (دمشـق-٢٠٠٦), ص٧٧؛ محمـدعلي الصـويركي الكـردي, الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ, الدارالعربية للموسوعات, (بيروت-٢٠٠٨), ج٣, ص١٦٥.

(٢) (شیخ عماد الدین بن ابی حامد ابن یونس) ناوی (محمَد بن یونس بن محمد بن منْعة) لـە بنەرەتدا ئەم زانایە خەلکی هـەولێربووە, وە یـەکێك بوو لـە لـە ماموسـتا هـەرە دیارەکـانی (ابن صلاح الشهرزوی) بوو لە موسل کە دەکری بلێین لـە دوای بـاوکی یەکـەم ماموسـتای بووە و لە سالی (٦٠٨ك/١٢١١ز) کۆچی دوایی کردووە.ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣" الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٥, ص١٩٣" اليـافعي, مـراة الجنـان وعـبرة اليقظـان, دارالكتب العلمية, بيروت-١٩٩٤), ج٤, ص١٤.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٤) زانسـتی (الفقـه) واتـە (تێگەیشـتن) لـە قورئـانی پـیرۆز و زانینـی یاسـا شـەرعیەکان و هـەلهێنجانی (احکـام الشـرعی) کـە لـە سەرچـاوە کـانی ئـەم زانسـتەوەرگیراون کـە ئەوانیشـقورئان و فـەرمووده وکـارو کردەوەکـانی پێغەمبـەر(د.خ) وهـەروەها ئیجتهـاد لـە (احکامـەکان) لـە پێنـاو وفـەتوادان و کارئاسـانی کـردن بـۆ خـەڵك لـە کاروبـاری دونیـاو دوارۆژیان. ابن منظور, لسان العرب, , ط٣, دار صادر (بيروت-١٤١٤هـ), ج١٣, ص٥٢٢؛ حاجي خليفة, كشف الظنون, ج٢, ص٤٨٢.

بواری فەرمووده سوودی لە(أبي جعفر عبيد الله بن أحمد البغدادي المعروف بابن السمين) وەرگرتووه [4]. پاشان سەردانی مەڵبەندەکانی ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامی دەکات و بڕیار دەدات بچێتە شاری (بەغدا)، کە مەڵبەندی زانست و گەشەکردن بووه[5].

---

(١) (الحديث):زانستێکە تایبەت بە فەرمووده و ووتەکانی پێغەمبەر (د.خ) و کارو کردەوەکانی، واتا گوتار و کردارەکانی و ئەوەی کە بینیویەتی و ڕەزامەندی خۆی لەسەر نیشانداوە و ڕەتی نەکردۆتەوە، وە ئەم زانستە بە زانستێکی گرنگ و بایەخدار دادەنرێت لەبەر ئەوەی دووەم سەرچاوەیە لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام لە دوای قورئانی پیرۆز. ابو سعد, السمعاني, ادب الاملاء والاستملاء, تحقيق: ماكس فايسفايلر, دار الكتب العلمية, (بيروت-١٩٨١) ج١, ص٣.

(٢) (الاصول):لە بنەڕەتدا لە (الاصل) هاتووه, بریتیە لەو بەلگانەی کە زانستی فقهی لەسەر بنیات دەنرێ, کە ئەوانیش بریتین لە قورئان و فەرمووده و یەکدەنگی زانایانی موجتەهید. خطيب البغدادي, الفقيه والمتفقة, : تحيق: عادل بن يوسف العزازي, دار ابن الجوزي, (د.م-١٤١٧), ج١, ص٧٩؛ عبدالكريم زيدان, الوجيز في اصول الفقه, ط٧, مؤسسة الرسالة, (بيروت-٢٠٠١م) ص٨.

(٣) (التفسير):زانستێکە لە زانستە ئایینیەکان و بە چاکترین و باشترین و گەورەترین زانست دادەنرێت, کە مەبەست لێی تێگەیشتنە لە مانا و زاراوەکانی قورئانی پیرۆز و هەلهێنجانی (ئەحکامە) کانیەتی بۆ ئەوەی ئاسانکاری بکرێت بۆ ئاسوودەبوونی خەلك لە دونیا و دوارۆژدا, هۆکاری هەروەها هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانی قورئان و چیرۆکەکانی بە گوێرەی تێگەیشتنی مرۆڤ. حاجي خليفة كشف الظنون, ج١, ص٤٢٧؛ هەمزە کاکەیاسین. حلوان لە سەردەمی خەلافەتی عەباسی تا روخانی مێرنیشینی عەننازی, (هەولێر-٢٠١٣) ل١٥٦؛ بەهار عباس جبرائیل, کردە زەرزاریەکان ڕۆلی رامیاری و شارستانیان لە هەردوو سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی, نامەی ماستەری بلاونەکراوەیە پێشکەشکراوە بە بە کۆلێژی زانستە کۆمەلایەتیەکان, زانکۆی کۆیە, (کۆیە-٢٠٠٨), ل١٠٩.

(٤) ابن الصلاح, علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٧؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص٣٢٦.

(٥) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابن الوردي, تاريخ ابن الوردي, ج٢, ص١٧١؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص١٦.

وا دياره له (بەغدا)ش لای چەند زانایەك دەست دەكات بە خوێندن؛ لەو زاناو ماموستایانەش بریتی بوون لەوانە(ابن سكينة)و(ابن طبرزذ أبي النجيب)و (دنيسر من إسماعيل بن إبراهيم النجار)و (على شرف الدين بن أبي عصرون)[1]. هەروەها دوای ماوەیەك بەغدا جێ دەهێڵێت و ڕوو دەكاتە خۆراسان و لەوێش دەست دەكات بە وەرگرتنی زانستی فەرموودە لای هەندێك لە شەرعزان و زانایان[2]، وە دواتر بەردەوام دەبێت لە گەڕانەكانی و سەردانی شاری (همدان)[3]دەكات و دەچێتەلای زانا(أبي الفضل بن المعزم)[4]، هەروەها سەردانی (نيسابور)[5] دەكات و دەچێتە لای چەند زانایەك لەوانەش (متصور الفراوي) و (المؤيد الطوسي) و( القاسم بن الصفار) دەكات و چەند شوێنێكی تریش دەگەڕێت لەوانەش شاری (مرو) [6].

هەروەها لە شاری (مرو) چاوی بەچەند زانایەكی تر دەكەوێ، یەكێك لەو زانایانەش (ابى مظفر السمعاني)بوو[7]. بەم شێوە دەبینیین، كە (ابن الصلاح) لە پێناوی دەست كەوتنی زانیاری لەسەرجەم بوارەكان بەتایبەتی لە بواری فەرموودەدا زۆر شوێن لەو ناوچانە گەڕاوە و سوودی زوری وەرگرتووە لە ماموستاو شەرعناسەكانی ئەو شارو ناوچانە، كە لەو كات ببوونە ناوەندێكی زانستی و

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٢) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابن فضل الله, مسالك الأبصار في ممالك الأمصار, المجمع الثقافي , (ابو ظبي-١٤٢٣ هـ), ج٥, ص٦٧٩؛ ابن الوردي, تاريخ ابن الوردي, ج٢, ص١٧١, الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٣) (همدان) یەكێك بووە لە شارە هەرە دیارو گرنگەكانی هەرێمی چیا.صفي الدين, مراصد الاطلاع, ج٣, ص٣٩٢.

(٤) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٥) (نيسابوور) بە (نيشابوور) یش ناوی دەهێنرێت و یەكێكە لە شارە گرنگەكان و مەلبەندی زانایانە, ياقوت الحموي, معجم البلدان, ج٥, ص٣٣١.

(٦) (مرو) یەكێكە لە بەناوبانگترین شارەكانی خراسان. يعقوبي, البلدان, (د.م-د.ت) ص٢١. ص٢١.

(٧) ابن الصلاح, علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٩؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

مەعریفی گەورە بۆ قوتابیان لە هەمموو ناوچەكان ڕوویان تێكردوون. وە هەروەها دوای ماوەیەك (ابن الصلاح الشهرزوری) بەرەو شام دەچێت [١]، لەوێش وەكو ناوچەكانی تر؛ كە چەندین زاناو كەسایەتی زیرەك ودیارو لێهاتووی بینیوەو گوێی بۆ گرتوون و سوودی گەورە و زۆری لێوەرگرتوون. هەروەها لە (دیمشق) گوێ دەگری لە چەند زانایەك لەوانەش:- (جمال الدین عبدالصمد)و (الشیخ موفق الدین المقدسي )و (فخرالدین بن عساكر)و (أبي الحرستاني)[٢]. وە هەروەها دوای ئەوەی دەچێتە (حەلەب) و لە خزمەتی چەند زانایەكی تر گوێ لە وانە و زانستەكانیان دەگرێ لەوانەش (ابی محمد بن علوان)[٣]، دواتر هەر لە (حەلەب) دەچێتە قوتابخانەی (الاسدیە)، كە لەلایەن (اسدالدین شیركۆ) ی مامی (سەلاحەددینی ئەییوبی) بنیاتنراوە[٤]. وە لە (حران )[٥] دەچێتە لای یەكێكی تر لە زانا دیارەكانی كە ئەویش ( الحافظ عبدالقادر) بوو ماوەیەك گوێ لە وانە زانستیەكانی دەگرێ[٦].

هەر بۆیە ئەم قوناغە لە ژیانی (ابن الصلاح) بە قۆناغێكی گرنگی گەشەكردن و پێگەیشتنی زانستی و هێزی ئەو دادەنرێ. وە دیارە ئەو ماوەیەی، كە (ابن الصلاح) دەچێتە (شام) تەمەنی لە دەوروبەری سی و شەش ساڵیدا بووە، كە

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦؛ احمد احمد محمود الخليل. مێژووی كورد لە شارستانی ئیسلامیدا), ص٣٧٣.

(٢) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٣) ابن الصلاح, علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٩.

(٤) تاريخ الاسلام ج١٣, ص٥٤٤؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن كثير, البداية البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(٥) (حەران): یەكێك بووە لە شارەكانی هەریمی جەزیرە، لەسەردەمی عومەری كوری خەتاب خەتاب (ر) فەتح كراوە. البلاذري،احمد بن يحيى بن جابر بن داود ، فتوح البلدان، دار ومكتبة الهلال-، (بيروت- ١٩٨٨ م) ص١٧٥؛

صفى الدين, مراصد الاطلاع, ج١, ص٣٣١.

(٦) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

دەکەوێتە ساڵی (٦١٣ك/١٢١٦ز)کۆچی[١]. دواتر (ابن الصلاح) ڕوو دەکاتە شاری (قودس)، کە لەوێ لە قوتابخانەی (الناصریە)[٢] بۆ ماوەیەك وەکو مامۆستا وانە دەڵێتەوە، کە ئەم قوتابخانە لە لایەن سولتان (سەلاحەددینی ئەییوبی)بنیاتنراوە[٣]. پاشان (ابن الصلاح) دەگەڕێتەوە بۆ (دیمەشق)و لەوێ دەمێنێتەوە و جێگیر دەبێت[٤]. دەبێت[٤]. وە دەبێت ئەوەشمان بیر نەچێت، کە (ابن الصلاح) بەر لەوەی جێگیر بێت بێت لە (دیمەشق) سەردانی (الحرمین) کردووە[٥].

ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێکەین ئەوەیە کە دەرکەوتنی (ابن الصلاح) لە کات و ساتیکی زۆر گرنگ و گونجاو بوو؛ کە ئەویش سەردەمی دەرکەوتن و بەهێزبوونی دەوڵەتی (ئەیوبی) بوو، کە بە دەیان سەروەری گەورەیان تۆمارکرد، هەر لە ڕووبەڕووبوونەوی خاچ دروشمەکان و هەروەها چاودێریەکی یەکجار باشی لایەنی شارستانیەتی ئەو دەوڵەتەیان دەکرد، بە تایبەتی لە ڕووی گرنگی دان بە قوتابخانەو زانایان و زانستەکان بە گشتی و زانستی ئیسلامیەکان بە تایبەتی[٦].

---

(١) الذهبي, سير أعلام النبلاء, ج ٢٣, ص ١٤٢؛ احمد محمود الخليل, مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا, ل٣٧٣.

(٢)قوتابخانەی (الناصرية) : يەکێك لەو قوتابخانانە بوو کە سەلاحەددینی ئەیوبی دروستی کردبوو لە قودس. امید ابراهیم جوزەلی, تقی الدین ابن الصلاح الشهرزوری, ص٢٥٨.

(٣) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ عبد الرحمن بن محمد, الأنس الجليل بتاريخ القدس والخليل, تحقيق: عدنان يونس عبد المجيد نباتة, مكتبة دنديس, عمان, ج٢, ص١٠٤؛ محمدعلى الصويركى الكردى, الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ, ج٣, ص١٦٥؛ کاوە, ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسلمانەکان, ل ٢٠٩.

(٤) ابن العماد, شذرات الذهب ج٥, ص ٢٢١.

(٥) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥.

(٦) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص ص٩-١٠؛ حجر العسقلاني, العسقلاني, النكت على كتاب ابن الصلاح, ص٢٢؛ محمد على الصلابى, صەلاحەددینی ئەیوبی, و:جمیل قادر, دارالفکر (بیروت-٢٠٠٨), ل ل٣٢٦-٣٢٧؛ احمد محمود الخليل, مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا, ل٣٧٣.

ئـەم گرنگـی دانـە زۆرەش بـە بـواری زانسـتە شـەرعیەکان زیـاتر لەسـەردەمی (سەلاحەددینی ئەیوبی)دەرکەوت؛ چونکە ئـەو خـۆی کەسـێك بـوو زۆر حـەزی بـە زانستە شەرعیەکان بووە، شوێنی تایبـەتی بـۆ ماموسـتاو فوتابیـەکان دانـاوە[1]، ڕۆڵی گەورەی بینیوە لە بنیاتنانی فوتابخانە و مزگەوت، کە کاریگەری گەورەی هەبووە لـە بەرەو پێشبردنی زۆربەی زانستەکان بە تایبەتی (فقه الشافعي) و چەندان بواری تـر، کە ببوونە سیمای دیاری ئەو دەوڵەتە[2].

دەکرێ بڵێین:- (ابن الصلاح) لـەو مـاوەدا، کـە گـەڕان و سـوڕانی زۆری کـردووە و هەموو ئەمانە وایان کردووە، کە ببێتە ئەزموون و دەسکەوتی زانستی زۆر بایەخدار لـە ژیـانی دا، کـە دواتـر بـە ڕوونـی ڕەنگدانـەوەی لەسـەر ژیـان و جوولـەو بیرکردنـەوەکانی دەردەکـەوی و دەبێتـە یـەکێك لـە کەسـایەتی و زانـا هـەرە ناودارەکانی ئەو سەردەم و خزمەتی گەورە و بەرچاو پێشکەش دەکات بـە فوتـابی و ئەو کەسانەی؛ کە سەردانیان دەکرد.

هەروەها (ابن الصلاح) ببووە جێی بایەخ و گرنگی پێدانی هـەموو لایـەك و لـە زۆرێك لە ناوەند و مەڵبەندە زانستی و ڕۆشنبیریەکانی ئەو کات داواکـراوە، ئەمـەش بەمەبەستی وانە گوتنەوە و سوود لێوەرگرتنی لـە بـواری زانسـتە شـەرعیەکان و بـە تایبەت لە زانستی فەرموودەدا؛ کە لە و سەردەمدا کەم وێنە بووە و خاوەن بەهرە و توانایەکی زۆرو هیممەتی گەورە بووە، وە هەر کە ناوی (شیخ) بێت مەبەست تـەنها (ابن الصلاح)ە[3]، کە ئەوەش گەورەیی و کاریگەری و بەهێزیی ئەو دەردەخات.

---

(١)احمد عبدالعزيز محمود ، ستەم و نادادی دەرهەق بەسەرکردەی موجاهید سەلاحەددینی ئەیوبی، ل ل٣١٣،٣٠٦.

(٢) ابو شامة، عيون الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، ج٢، ص ص٤٤٤-٤٤٨).

(٣) ابن الصلاح، علوم الحديث، ص١١؛ ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ السخاوي ، فتح المغيث بشرح الفية الحديث للعراقي، تحقيق: علي حسين علي، مكتبة السنة(مصر- ٢٠٠٣)، ج١، ص١٦.

بۆیە ئەوەی تێبینی دەكرێ، كە (ابن الصلاح الشهرزوري) بەهۆی بەرفراوانی و ئەو تێگەیشتنە قووڵەی، لە زانستە شەرعیەكان و بە تایبەتی لە زانستی فەرموودەناسیدا زۆر سەركەوتوو بووە لە گوتنەوەی وانە لە زۆرێك لە قوتابخانە بەناوبانگەكانی ئەو كات و ڕۆڵی گەورە دەبینێت لە پێگەیاندنی چەندین قوتابی، كە لە دواتر دەبنە ئەستێرەیەكی گەش لە ئاسمانی زانست و زانیاریدا و كاریگەری گەورە بەجێ دەهێڵن بەسەر كۆمەڵگەو شارستانیەتی ئیسلامی.

هەروەها دوای ئەوەی (ابن الصلاح الشهرزوري) دەگەڕێتەوە (دیمەشق) لەوێ لە قوتابخانەی (الرواحيە)[1] دەبێتە ماموستا و كاری وانەبێژی (التدريس)[2] دەكات، وە ئەم قوتابخانەیە لە لایەن (الزكي أبو القاسم هبة الله بن عبد الواحد ابن رواحة الحموي) بنیاتنراوەو گەشەی پێدراوە [3]. ماوەیەكیش لەوێ خزمەت دەكات و دواتر دەچێتە قوتابخانە یاخود (خانەی فەرموودە) لە (دیمەشق) (دارالحديث)، كە لەلایەن مەلیك (ئەشرەفی كوڕی مەلیك عادلی كوڕی ئەییوب)ەوە بنیاتنراو. وە هەر لە

(١) (الرواحية) ئەم قوتابخانە لە ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی (ابن عروة) لەتەنیشت مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق دروستكرا لەلایەن (زكي الدين ابن رواحە) وە لە ساڵی (٦٢٢ك) وەفاتی كردووە.. محمد كرد علي, خطط الشام, ط٣, مكتبة النوري, (دمشق- ١٩٨٣ م), ج٦, ص٧٩.

(٢) وانە بێژی: بە یەكێكە لە كارەئاینیە بایەخدار و گرنگەكانی دادەنرێت, لە خوێندنگەكانیش زانستە ئاینیەكان و ئەوەی پەیوەندە بە ئایینی ئیسلام دەخوێنرا, وەك زانستەكانی شەرعزانی و لێكدانەوەی فەرموودە و زمان و...هتد, وە ئەو كەسانەی كە تەرخان دەكران بۆ وانە گوتنەوە دەبوایە كەسانێكی ئاست بەرزبن لە ڕووی زانستی و ئاینیەوە. القلقشندي, صبح الأعشى في صناعة الإنشا, تحقيق: د.يوسف علي طويل, دار الفكر, (دمشق -١٩٨٧م) ج, ص٢٩.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص١١؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

ماوەیدا (ابن الصلاح) توانیویەتی خزمەتێکی گەورە بکات بە خەڵك و دەوروبەرەکەی[1].

دوای ماوەیەك (ابن الصلاح) دەچێتە قوتابخانەی (زمردخاتون)[2]، کە بە قوتابخانەی (ست الشام) بەناوبانگ بووە، وە لەلایەن خوشکی سوڵتان(سەلاحەددینی ئەییوبی)ەوە دروست کرابوو[3].

بە پێی ئەو سەرچاوانەی، کە باس لە (ابن الصلاح الشهرزوری) دەکەن، وا ڕوون دەبێتەوە کە ئەو زاناو کەسایەتیەکی گەورە و ناودار بووە، لەوانەبووە کە پێویست دەکات بە شانازیەوە ناوی بهێنرێ، دیارە لە ئەنجامی ئەو هەموو گەڕان و هیممەت بەرزیە گەیشبووە ئاستێك نەك تەنها لە زانستی فەرموودەدا پێبگات و شارەزایی پەیدابکات؛ بەڵکو یەکێك بووە لە زانا ناودارەکانی سەردەمی خۆی و شارەزایی لە زۆر بواردا هەبووە، هەروەکو میژوونووس (ابن خلكان) لە کتێبەکەیدا بەمشێوە باسی کردووە دەڵێت:- ((شارەزایی هەبووە لە بوارەکانی (التفسير والحديث والفقه وأسماء الرجال وما يتعلق بعلم الحديث ونقل اللغة، وكانت له مشاركة في فنون عديدة، وكانت فتاويه مسددة) [4] .

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٢) زمرد خاتون: ياخود (ست الشام كچی نجم الدين ئەیوب) کە قوتابخانەیەکی دامەزراند و ناسراوە بە قوتابخانەی (شامیە) ناوی دەرکردووە, هەروەها بە (الحسامیە) ش ناسراوە کە کوری (ست الشام) بووە گۆڕی هەردووکیان لەو شوێنەیە. النعيمي, الدارس فی تاريخ المدارس, ج١, ص٢٢٧؛ اميد ابراهيم الجوزلی, تقی الدين ابن الصلاح الشهرزوری, ص٢٦٣.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص١١؛ ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٤) وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣.

بەم شێوە توانی لە زۆربەی لایەنەکان خۆی پێبگەیەنێ و دەبێتە خاوەن زانستیکی سوودبەخش و مۆڵەتی زانستی (الاجازات العلمیة) [1] وەردەگرێت لای زانا و مامۆستا ناودارەکانی ئەو کات، پاشان خزمەتی زۆرو گرنگ پێشکەش بە جیهانی ئیسلامی و ناوچەکە دەکات، بەلأم ئەو زۆرترو زیاتر ناوبانگی لە زانستی فەرمودەدا دەرکرد؛ چونکە ئەو خاوەنی بەرهەم و لێهاتوویەکی کەم وێنە بوو لەو بوارەدا، بە تایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی (معرفة انواع علوم الحدیث) [2].

(ابـن الصـلاح الشـهرزوری) تـوانی قۆناغـەکانی پێگەیشـتن و پلـەی زانسـتی بەشێوەیەکی رێك و پێك ببڕێ، لە ماوەیەکی دیاریکراو بگاتە ئاستێکی زانستی بالاّ، دەبێتەخاوەن پێگەیەکی دیارو زانا وشارەزایەکی کاریگەر و بە هەیبەت و گەورە[3].

سەبارەت بە بیروباوەری(ابن الصلاح الشهرزوری)و تێگەیشتنی لە دەق و ماناو زارەوە شەرعی و بنەما سەرەکیەکان، بەجۆرێك بووە، کە تایبەتمەنیەکی خۆی هەبووە، لەسەر هەندێ پرس و بابەت خاوەن راو بۆچوونی تایبەتی خۆی بووە، بە پشت بەستن بە هەندێ سەرچاوەو رای باوەڕ پێکراو و بەهێز، وە هەڵوێست و بۆچوونەکانی جێی بایەخ بوونە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو پێگەیشتن و ئەو هەوڵ و تێکۆشانە زۆرەی، کە کردوویەتی لە ماوەی تەمەنیدا؛ بۆیە زۆر لە زانا و پێشەوایان بە گرنگیەوە باسیان کردووە، هەروەکو (الذهبي) لە بارەی بیرو باوەریەوە دەڵێت:-

(کان متین الدیانة، سلفي الجملة، صحیح النخلة، کافًا عن الخوض في مزلات الأقدام ، او کان سلفيًا حسن الاعتقاد، کافًا عن تأویل المتکلمین مؤمنا بما ثبت من النصوص

---

(١) مۆڵەتی زانستی: بریتیە لەو مۆڵەت و رێگە پێدانەی کە ماموستا یاخود شێخەکە دەیدات دەیدات بەو کەسانەی کە بابەتی زانستی لێوەردەگرێتەوە. ئەمەش دوای برینی چەند قۆناغێکی خوێندن و مامۆستاکەی دڵنیا دەبێت لە ئاستی کەسەکە تا ئەویش بتوانێت وانە بڵێتەوە. عبداللە فیاض، الاجازات العلمیة عندالمسلمین، (بغداد –١٩٦٧) ص٢١.

(٢) الذهبي، سیر اعلام النبلاء، ج١٦، ص٣٦٠؛ شمس الدین سامی، کورد و کوردستان، و:ئەحمەد تاقانە، چ٢، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر–٢٠١٠)، ل١٠٨.

(٣) ابن الصلاح، علوم الحدیث، مقدمة المحقق، ص٧؛ ابن خلکان، وفیات الأعیان، ج٣، ص٢٤٣ ؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٨، ص١٠٩.

غير خائض ولا معمق) [1]. كەواتە خاوەن بیروباوەڕێکی دروست و باش بووە لەسەر ڕێچکەی پێشینە چاکەکان بووە و دوورە بووە لە هەر جۆرە لادانێك و باوەڕی تەواوی بەخوای گەورە هەبووە، وە ئەو خاوەن بیروباوەریکی خاوێن بووە و دوور بووە لە زانستی (الکلام)، هەروەها هەموو ئەو شتانەی، کە موسڵمانان دوور دەخەنەوە لە بیروباوەری دورستی ئیسلام [2].

دیارە (ابن الصلاح) لەبارەی فەلسەفەو مەنتقەوە بۆچوونی خۆی هەیەو دەڵێت:- (الفلسفة رأس السفه والانحلال ومادة الحيرة والضلال ومثار الزيغ والزندقة ومن تفلسف عميت بصيرته عن محاسن الشريعة المؤيدة بالحجج الظاهرة والبراهين الباهرة ومن تلبس بها تعليما وتعلما قارنه الخذلان والحرمان)(٣)، واتە( زانستی فەلسەفە بناغەی گێلی و نەفامی و سەرچاوەی گومڕایی و سەرلێشێوانە، وە کانگای گومان و بێ دینیە، وە هەر کەسێك خەریك بێت بە فەلسەفەو بە چاکی بزانێت ئەوە کوێردەبێت لە ئاستی بینینی کارە جوانەکانی ئەم شەریعەتە پاکە؛ کە پاڵپشتە بە بەهێزترین بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو دەستەوەسێنەر، وە هەرکەسێك سەرقاڵ بێت بە فەلسەفە جاچ خۆی فێربکات یاخود کەسانی تر، ئەوە مایەی بێ بەشی و نەگبەتیە)

سەبارەت بە زانستی ژیری (منطق)؛ (**ابن الصلاح الشهرزوري**) **دەڵێت**:- (منطق فهو مدخل الفلسفة ومدخل الشرّ شرّ وليس الاشتغال بتعليمه وتعلمه مما اباحه الشارع ولا استباحه أحد من الصحابة والتابعين والأئمة المجتهدين والسلف الصالحين وسائر من يقتدي به من أعلام فالواجب على السلطان أن يدفع عن المسملين شر هؤلاء المشائيم ويخرجهم من المدارس ويبعدهم ويعاقب على الاشتغال بفنهم

(١) تذكرة الحفاظ: ج٤, ص ١٤٣١.

(٢) ابن الصلاح, ادب المفتي والمستفتي, ص١٥.

(٣) ابن الصلاح, فتاوى ابن الصلاح, ص٢١٠.

وعزل من كان مدرس مدرسة من أهل الفلسفة والتصنيف فيها والإقراء لها ثمَّ سجنه ...)[1].

پێی وایه ئەم زانسته دەرگایەکه بۆ فەلسەفه، دەرگای خراپه هەر خراپەیه، وە(ابن الصلاح) بۆچوونی وا بووه، کە نه هاوەڵەکان و نه تابیعینەکان و نه پێشینه و پێشەوا و زاناکان ڕێگەیان نەداوەو بە باشیان نەزانیوه خۆ خەریك کردن بەو زانستانه، ناسینی حوکمە شەرعیەکان پێویستی بەم زانسته نییه و تەنانەت بەکارهێنانی زاراوه مەنتقیەکانیش بە کارێکی ناڕەوای زانیوه، وه ئەو دەڵێت:- ((دەبێت دەسەڵاتداران سزای ئەو کەسانه بدەن؛ کە خۆیان سەرقاڵ دەکەن بەو زانستانەو دەبێت لە قوتابخانەکان دەربکرێن و ڕێگەیان پێنەدرێت وانه بڵێنەوه)).

ئەوەی تێبینی دەکرێ؛ کە هەڵویستی (ابن الصلاح الشهرزوري) بەرامبەر فەلسەفه و ژیری (المنطق) زۆر توندە، کە بە شێوەیەکی ڕەها ڕەتیکردۆتەوه، ئەوەش پەیوەندی بەو بارودۆخە سیاسیەی ئەو کات هەبووه؛ چونکە بەشێوەیەکی گشتی لە ناو دەوڵەتی (ئەییوبی) هەریەکە لە زانستی فەلسەفەو ژیری بەشێوەیەکی فەرمی ڕەتدەکرایەوه؛ تەنانەت زۆر بەتوندی دژایەتی فەیلەسوفان کراوه؛ تا گەیشتۆتە ڕاددەی کوشتنی فەیلەسوفان، هەروەکو بەفەرمانی سوڵتان(سەلاحەددین ئەییوبی) زاناو فەیلەسوفی ناوداری ئەوکات(شهاب الدين السهروردي)[2] دەکوژرێت[3]. ئەم مامەڵە توندەی بەرامبەر بە فەلسەفه، کە لەلایەن زانایان و دەسەڵاتدارانی (ئەییوبی)یەکان کراوه؛ هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوه بۆ ئەوەی، کە بەشێکی زۆر لەزانایان و دەسەڵاتدارانی(ئەییوبی) پێیان وابوو، زانستی فەلسەفه لە بەرژەوەندی

(١) ابن الصلاح, فتاوى ابن الصلاح, ص ص٢١٠-٢١١.

(٢) (السهروردي ) : ابو الفتوح يحي بن عبش بن اميرك ، زانایەکی موسلمانی بەناوبانگ بووە لە زانستی فەلسەفه و خاوەن چەندین پەرتووك بووه وەکو (التلويحات) و (حكمه الاشراق) لە سالی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) لە زیندانی حەلەب کوژراوه. ياقوت الحموي ، معجم الادباء ، :إحسان عباس، دار الغرب الإسلامي، (بيروت – ١٩٩٣م) ج٦، ص ص٢٨٠٦_٢٨٠٧ ؛ ابن خلكان ، وفيات الاعيان ، ج٦،ص ص٢٧٣،٢٧٦.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧،ص١٩٢.

بیرۆكەی باتنی شیعه مەزهەبەكانه؛ كه ئەوان له رێگەی ئەم زانستەوه دەیانویست بارودۆخه كه بقۆزنەوه؛ بۆ بەرژەوەندی هزری شیعەگەری لەناوچەكەدا [1].

هەروەها دەكرێ ئەوەش بگوترێ، كه هەندێ بیركردنەوەو بۆچوونی فەیلەسوفانی ئەوكات، جێی قبول كردن نەبووه لای بەشێك له زانا و پێشەوا موسڵمانەكان، كه ئەمەش ڕەنگدانەوەی لەسەر بیركردنەوەكانی(ابن الصلاح الشهرزوری) هەبووه. هەروەها دەشكرێ ئەوبارودۆخه سیاسیه ناهەموارەی ئەوكات توانای قەبوڵ كردنی ئەوجۆره بیرۆكانەی نەكردبێ؛ چونكه (ئەییوبی)یەكان له هەوڵی یەكخستنی بەرەیەكی یەكگرتوو بوون بەرامبەر به خاچیەكان؛ بۆیه ئەم جۆره بیرۆكانه به ڕای ئەوان دەبووه مایەی لێكترازانی كۆمەڵگەی ئیسلامی.

## تەوەرەی پێنجەم: مردنی (ابن الصلاح الشهرزوری):-

زانای گەورەو ناودار (ابن الصلاح الشهرزوری) دوای ئەوەی شەست و شەش ساڵی له تەمەنی پڕ له بەرەكەتی بەڕێكرد، ئیتر بەیەكجاری ماڵئاوایی له هەموو قوتابی و ماموستاو كەسو كارو دۆستانی دەكات، مێژوونوسان یەك دەنگ و كۆكن لەسەر ساڵی مردنی (ابن الصلاح الشهرزوری)، كه له بەیانی ڕۆژی چوارشەممە[2]، له بیست و پێنجی ڕەبیعی دووەم[3]، دیاره لێرەدا هەندێ له مێژوونوسان دەڵێن ڕۆژی مردنەكەی (٢٦)ی ڕەبیعی دووەمە[4]، هەروەها مێژوو نووسی تر پێی وایه (١٥)ی ڕەبیعی دووەم[5]، له ساڵی (٦٤٣ك) له (دیمەشق) كۆچی دوایی كردووه[6]، وه له دوای نیوەڕۆ نوێژ لەسەر تەرمەكەی كراوه[7].

---

(١)ناصر محمد علي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي،ص٧٦.

(٢) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣، ص٢٤٣.

(٣) الذهبي, تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٥٠؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٣٨٣.

(٤) النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص١٧.

(٥) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥.

ئەوەی جێی باس کردنە، کە لە کۆتاییەکانی تەمەنی و ساتەوەختی مردنی (ابن الصلاح الشهرزوری) بارودۆخی ناوچەکە لە حاڵەتێکی زۆر ناجێگیرو دژوار و تەنگ بووە؛ بە هۆی ئەو بارودۆخەی، کە هەرەشەیەکی گەورەی لەسەر ناوچەکە دروست کردبوو، بەهۆی بوونی (خوارزمەکان)[3]، کە لە هەوڵی دەست بەسەر داگرتن و گەمارۆدانی تەواوی ناوچەکەدابوون.

دوای ئەوەی (ابن الصلاح الشهرزوري) لە ناوەوەی (باب الفرج) دەشۆردرێت و بۆ جاری دووەم نوێژ لە سەر تەرمی دەکرێ، بەڵام مێژوونوسان باس لەوە دەکەن، کە خەڵك نەیانتوانی بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ تەرمەکەی بڕۆن بۆ ناشتنی لەبەر ئەوەی ئەو کاتە دیمەشق لە ژێر گەمارۆی خوارزمەکان بووە[4].

دیارە ژمارەیەکی یەکجار کەم خەڵك لەگەڵ تەرمەکەی چوون بۆ ناشتنی؛ کە تەنها دەکەس بوون [5]، ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە، کە بارودۆخە سیاسیەکە زۆر

---

(١) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٥٠؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن هداية الله الحسيني, طبقات الشافعية, تحقيق:عادل نويهض, دار الافاق الجديدة, (بيروت-١٩٧١) , ص٢٢١ ؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦؛ الداودي, طبقات المفسرين, دار الكتب العلمية, (بيروت- د.س), ج١, ص٣٨٤.

(٢) ابن خلكان, وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٣) (خوارزمەكان) ئەوان ئەو نەتەوەن كە ڕەچەڵەكیان دەگەڕێتەوەوە بۆ (خوارزم) وە دەسەلاتیان گەشەی كرد لە سەدەكانی ناوەراست, وەهاتنە ناوەوەیان بۆ ناو ئیسلامیش لە ڕێگەی سەلجوقیە توركەكانەوە بوو وە پشتیان بە مەلیك سالح ئەیوب دەبەست بۆ وەرگرتنی دیمەشق لە دەستی مامی مەلیك صالح اسماعیل ؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج١٦, ص٣٦٢.

(٤).الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج١٦, ص٣٦٢؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٥) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

نالەبارو ناخوش بووە، وە خەڵك زۆر بەم ڕووداوە خەفەتبارو دڵتەنگ بووە.

هەروەها (ابن الصلاح الشهرزوری) تەرمەکەی لە گۆڕستانی (الصوفیه)[1] دەنێژرێ[2] .

بەم شێوە بۆ دواجار (ابن الصلاح الشهرزوری) ماڵئاوایی کرد، ئەوەی جێی باسە، کە ئەو زانایە هەر ئەوەندەیە لە کوردستان و (شارەزوور) لە دایك بووەو دواتر خولیای خوێندن وای لێکردووە، کە وڵات وکەس و کاری بەجێ بهێڵێ و ڕوو لە (موسڵ)و (بەغدا)و (خۆراسان)و (شام) وزۆر شوێنی تر بکات و خزمەتی گەورە بە ناوچەکە و تەواوی شارستانیەتی ئیسلامی دەکات و ناو وناوبانگی لە ناو لاپەڕە زێرینەکانی ئەو شارستانیەتە بە زیندوویی ماوەتەوە.

---

(١) الصوفية: گۆرستانێکی بەناوبانگە دەکەوێتە دەرەوەی (باب النصر) لە ڕۆژئاوای شاری دیمەشقە، کە تەرمی بەشێکی زۆر لە زانایانی بەناوبانگی ئیسلامی تیایدا نێژراوە لەوانەش شێخ (ابن تیمیه الحرانی) لەم گۆرستانە نێژراوە. ابن عساكر, تاريخ دمشق, ج٥٨, ص١٤؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٧٥؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج١, ص٦٨.

(٢) ابن خلكان. وفيات الأعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج١٦, ص٣٦٢؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج١٨, ص١٠٩؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

# بەشی دووەم:

# لایەنی ڕۆشنبیری ( ابن الصلاح الشهرزوری ).

تەوەرەی یەکەم: گەشتی زانستی و مامۆستاکانی ( ابن الصلاح ).

تەوەرەی دووەم: قوتابیەکانی ( ابن الصلاح ).

تەوەرەی سێیەم: ڕۆلی ( ابن الصلاح ) لە بڵاوکردنەوەی زانستیدا.

یەکەم: قوتابخانەی ( الصلاحیة ).

دووەم: قوتابخانەی ( الرواحیة ).

سێیەم: دار الحدیث الاشرفیة.

چوارەم: قوتابخانەی ( الشامیة الجوانیة ) ست الشام زمرد خاتون.

## بەشی دووەم :- لایەنی رۆشنبیری ( ابن الصلاح الشهرزوری ) :-

### تەوەرەی یەکەم :- گەشتی زانستی و ماموستاکانی :-

گەشت(الرحلە) گەشت بەمانای گەڕان و ڕۆیشتن دێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستێکی دیاریکراو[1]، گەشت کردن نرخێکی فێرکاری تایبەتی هەیە، گەشتی زانستی، کە جۆرێکە لە جۆرەکانی گەشت [2].

گەشتی زانستی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گەشەپێدانی ژیانی زانستی لە هەموو سەردەمەکان، هەربۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر هانی خەڵکی داوە بۆ گەڕان بەدوای زانستدا، لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەم بابەتە زۆر بە ڕوونی کراوە؛ هەروەکو دەفەرموێ { فَلَوْلا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ}[3]، واتە:- (دەی بۆچی لە هەر هۆزو دەستەیەك نەچن بۆ خوێندن، تا شارەزا بن، لە ئایین تێبگەن و فێربن و قەومەکەشیان تێبگەیەنن و فێریان بکەن کاتێك، کە گەڕانەوە بۆ لایان، بۆ ئەوەی ئەوان هۆشیار ببنەوە، خۆیان بپارێزن لە گوناه، خوا لە خۆیان نەرەنجێنن.

هەروەها لە فەرموودەکانی پێغەمبەریش ئاماژەی پێکراوە، هەروەکو لەم فەرموودەیە باسکراوەو دەفەرموێ:- (مَا مِنْ رجُل يَسْلُكُ طَرِيقًا يطلب فِيهِ عِلْمًا، إِلَّا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقَ الْجَنَّةِ) [4]، واتە:- (هەر کەسێك ڕێگەی وەرگرتنی زانستی گرتە بەر، خوای گەورە ڕێگەی چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات).

---

(١) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گەشتی زانستی و جۆرەکانی بروانە: جعفرحسن صادق، (الرحلات العلمية من الاندلس الى المشرق)، رسالة ماجستير غير مطبوعة، (جامعة الموصل)، موسل١٩٨٥، ص ص ١٤-٣٢

(٢) اميد ابراهيم جوزەلى، الحياة العلمية في اربل، مطبعة روزهەلات، (اربيل -٢٠٠٨)، ص٦٤.

(٣) سورة التوبة، ئايەتی ١٢٢.

(٤) ابو داوود، سنن ابو داود، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد، المكتبة العصرية، (بيروت-د.ت)، ج٣، ص٣١٧.

بــەم مشــێوەیە لــە دەوڵــەتی ئیســلامیدا؛ کــە یــەك ئــایین و یاســای تێــدا پەیرەودەکرا؛ تاکەکەس بە ئازادانە دەیتوانی بە کارەکانی خۆی هەستێت و گەشت بکات لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە ڕێگری و کۆسپێك بێتە بەردەمیان، ئەو ناوچە بەرفراوانانە وەك یەك دەوڵەت دەهاتە بەرچاو[1]، ئــەو کــات لەگــەڵ ئــەوەی ڕێگاکــان زۆر ســەخت و دژوار بــوون، هۆیــەکانی گواســتنەوە ڕێکنەخرابوون؛ بەلاَم دیارە هیممەت و ویستێکی گەورە هەبووە بۆ گەڕان بەدوای زانست و زانیاری .

سەبارەت بە گەشتی زانستی (ابن خلدون) لە کتێبەکەیدا (المقدمە) زۆر بە ڕوونی ئاماژەی بەوە کردووە، بەناوی (گەشتی زانستی و چاوپێکەوتنی شێخەکان فێربوون کاریگەرتر دەکات، وە (ابن خلدون) پێی وایە ئەم شێوە سوودی زۆرە، کە بریتیە لە ڕاستەوخۆ گوێ گرتن لە زاناو مامۆستاکان، جگە لە زانستەکە کۆمەڵێك سوودی تریش وەردەگریت، هەروەکو باسی کردووەو دەڵێت:- (ان الرحلة فی طلب العلم واقاء المشیخة مزید الکمال فی التعلیم)[2]، واتە:- (بەڕاستی گەشت کردن بۆ دەست خستنی زانست و گەیشتن بە پیاوچاك و زانایان، لە تەواو کاریەکانی فێربوونە).

دیارە فێرخوازان گەشتی زانستی و وەرگرتنی زانستەکانیان ڕاستەوخۆ لە مامۆستاکانیان پێ باشتر بووە، کە لێکۆڵینەوە زانستیەکانیش ئەو ڕاستیەیان سەلماندوە، هەر بۆیە پێوەرو هەڵسەنگاندنیان بۆ قوتابیان لەو کاتدا بریتی بووە لە ڕادەی گەشت کردن و گەڕانیان بە ناوچە جیاجیاکان و چوونیان بۆ لای مامۆستا و شیخە دیارەکان؛ بەمەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری، ئەو گەشتە زانستیانەش تەنها بۆ زانستە شەرعیەکان نەبووە؛ بەلکو زانستەکانی تریشی لەخۆ دەگرت لە بوارە جۆراوجۆرەکان .

---

(١) احمد شلبی, تاریخ التربیة الاسلامیة, (بیروت– ١٩٥٤), ص٣٠٨.

(٢) مقدمة, ص٣٤٨.

(ابــن الصــلاح الشــهرزوری) ســووربووه لەســەر وەرگرتنــی زانیــاری و زانســتە شــەرعیەکان؛ لــەو پێناوەشــدا زۆرتــرین گەشــتی زانســتی بــۆ زۆربــەی ناوچــە ئیسلامیەکان کـردوه، بەمەبەسـتی گەیشـتن بـە زانایـانی ئـەو سـەردەم لـە ناوچـە جیاجیاکان. گەشتی (ابـن الصـلاح الشهرزوری) بـۆ ناوچـەکانی (موسـل)و (بەغـدا)و (هەمەدان)و (نیسابور)و (مرو)و (حەڕان)و (شام) و شـوێنی تـر، لـە پێنـاو وەدەسـت هێنـانی زۆرتـرین زانیـاری لەسـەر زانسـتە جۆربـەجۆرەکان، کـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی ڕۆشنبیری (ابن الصلاح) هەمەلایـەن و گشـتگیر بێـت، بەواتایـەکی تـر هـەر تـەنیا لـە زانستی فەرمووده شارەزانەبوو، بەڵکو یەکێك بوو لە کەڵەزاناکانی سـەردەمی خـۆی، لە زۆریك لە بوارەکاندا. هەر بۆیـەش بـە پێـی گەشت و گەڕانـەکانی (ابـن الصلاح ) ڕیزبەندی بۆ ناوچە و ماموستاکانی دەکەین [1].

**موصل:-**

گرنگترین ئەو زانایانەی، کە (ابن الصلاح ) لە (موسڵ) چاوی پێیـان کـەوتوون و بۆتە قوتابی لە لایان و زانستی لێوەرگرتوون ئەمانەن:-

**(عمادالدين ابو حامد محمد بن يونس بن منعة الاربلي الموصلي الفقية الشافعي)**[2]، لـە ساڵی( ٥٣٥ك/١١٤٠ز) لـە دایـك بـووە، شـارەزایی هـەبووە لـە بـواری (المـذهب ،الاصـول، خلاف)، لە (موسڵ) لەسـەر دەسـتی بـاوکی پێگەیشـتوە و پاشـان گەشـتی زانسـتی بـۆ (بەغدا) ئەنجامدەدا، لە قوتابخانەی (النظامية)[3] لە لای چـەندین زانـای بـەناوبانگی

(١) اليافعي, مرآة الجنان وعبرة اليقظان, ج٤, ص٨٥.

(٢) اليـونيني, ذيـل مـرآة الزمـان, ج٣, ص١٤؛ الـذهبي, تـاريخ الاسـلام, ج١٣, ص٢٠٠؛ اليافعي, مرآة الجنان وعبرة اليقظان, ج٤, ص٨٥.

(٣) ئـەم خوێندنگایـە لـە لایـەن وەزیـری سـلجوقی (نظـام الملـك) دامـەزراوە لـە سـاڵی (٤٥٩ك/١٠٦٦ز) تـەواو بـووە و خوێنـدن تیایـدا دەسـتیپێکردووە. بـن خلكـان, وفيـات الاعيان, ج١, ص١٠٩.

ئـەو كـات خوێندويـەتی، وە پاشـان گەڕاوەتـەوە (موسـڵ)و لـە چـەندين قوتابخانـە خەريكی وانە گوتنەوەبووە [١].

هەروەها (ابن الصلاح) لە كاتی گەشتە زانستيەكەی بۆ (موسڵ) لای ئـەو زانايـە خـەريكی خوێنـدنی زانسـتی شەرعناسـی(الفقـە)بـووە [٢]، وە ئـەم زانايـە دوای خزمەتێكی زۆر لەساڵی (٦٠٨ك/١٢١١ز) كۆچی دوايی كردووە[٣].

**(ابن السين، ابوجعفر عبيدالله بن احمد)** [٤]، لە ساڵی (٥٢٣ك/١١٢٨ز)لەدايك بـووە، لـە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی(جنزە)[٥] لە (بەغدا) لـەلای چـەندين زانـا زانسـتی فـەرموودەی خوێنـدووە، بۆتـە فـەرموودەناس (المحدث)ێكـی ديـاری شـاری (بەغـدا)و (موسـڵ)[٦]، ئـەم زانايـە يـەكێك بـووە لـە نـزيكترين ماموسـتاكانی(ابن الصـلاح الشهرزوری)[٧] هەروەها لەساڵی (٥٨٨ك/١١٩٢ز) لە (موسڵ) كۆچی دوای كردووە[٨].

---

(١) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٤, ص٢٥٣؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٢٠٠.

(٢) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٤.

(٣) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٢٠٠.

(٤) ابن الاثير, اسد الغابة, تحقيق: علي محمد معوض واخرون, دار الكتب العلمية, (بيروت_ ١٩٩٤), ج٥, ص٢٣١؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤٠.

(٥) جنـزة: گـەورەترين شـاری (اران) ە دەكەوێتـە نێـوان (شـروان) و(اذربيجـان) وە نـاوە گشتيەكەی پێی گوتراوە (كنجە), شارێكی بەخێرو بێرەو خەلكەكەشی چاكن. ياقوت الحموي, معجم البلدان, دار صادر, (بيروت-١٩٩٥), ج٢, ص١٧١؛ القزويني, آثار البلاد واخبار العباد, دار صادر, (بيروت, د.س), ص٥٢٢.

(٦) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٦, ص٤٨١.

(٧) السبكي, طبقات الشافعية, ج٨, ص٣٢٦

(٨) ابن المستوفي, تاريخ اربل, تحقيق: سامي بن سيد خماس الصقار, دار الرشيد, (بغداد_ ١٩٨٠, ج٢, ص٦٩٥؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٦, ص٤٨١.

**(نصر الله بن سلامة بن سالم الهيتي، أبو المعالي)**، ئەم زانایە ماوەیەك لە (بەغدا) خەریکی وانە گوتنەوە بووە، دواتر دەچێتە (موسڵ)و لەوێش بەردەوام دەبێت لە پێدانی زانست بە قوتابیەکانی، هەروەها یەکێك بووە لە فەرموودەناسەکان [1].

هەروەها(ابن الصلاح الشهرزوری)یش یەکێك لە قوتابیەکانی بووە [2] . لە کۆتاییەکانی تەمەنی دەچێتەوە (هیت)[3]، وە هەر لەوێش لە ساڵی (٥٩٨ك/١٢٠١ز) ماڵئاوایی لە دونیا دەکات [4].

-**(كمال بن يونس، موسى بن محمد بن يونس بن محمد بن منعة، أبي الفتح الموصلي الشافعي)**، ئەم زانایە یەکێك بووە لە شەرعزانە(الفقیە) ناودارو لێهاتووەکان، وە (ابن الصلاح) سوودی باشی لێوەرگرتووەو بە گرنگیەوە باسی کردووە لە ساڵی(٦٣٩ ك/١٢٤١ز) کۆچی دوایی کردووە [5].

-**(ابو المظفر بن البرني)**[6] ئەمەش یەکێك بووە لە ماموستا هەرە دیارەکانی (ابن الصلاح)، وە لە لە بواری (فقه) لێهاتوو بووە، سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە کردووە، کە لە (موسڵ) ماوەیەك لای خوێندووەو شارەزایی زاستی شەرعی ( فقه) بووە [1].

---

(١) ابن النجار, ذيل تاريخ بغداد, تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا, دار الكتب العلمية (بيروت_١٩٩٧), ج٥, ص١٦٦؛ ابن الصلاح و سراج الدين, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح, تحقيق: د عائشة عبد الرحمن, دارالمعارف(فاس-د.ت), ص١٥؛ ابن النقطة الحنبلى البغدادى, إكمال الإكمال, تحقيق:عبد القيوم عبد ريب النبي, جامعة أم القرى, (مكة المكرمة-١٤١٠), ج٢, ص٤٥٩؛ ابن الدبيثى, ذيل تاريخ مدينة السلام, تحيق: بشار عواد معروف, دار الغرب الإسلامي, (د.م, ٢٠٠٦), ج٥, ص٧٣.

(٢) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤٠.

(٣) هيت: شارێكە دەكەوێتە نیوان (الرحبة) و (بغداد) لەسەر رووباری فوراتە, ئەو شوێنە زەویەكەی نزمە.الحمير, الروض المعطار في خبر الأقطار, تحقيق: إحسان عباس, مؤسسة ناصر للثقافة, (بيروت -١٩٨٠), ج١, ص٥٩٧.

(٤) ابن النقطة الحنبلى البغدادى, إكمال الإكمال, ج٢, ص٤٥٩؛ ابن الدبيثى, ذيل تاريخ مدينة السلام, ج٥, ص٧٣.

(٥) سراج الدين, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاع, ص١٥.

(٦) ابن حجر العسقلاني, لسان الميزان, ج٧, ص١٤٦.

هـەروەها زۆر شـوێن گـەڕاوەو سـەردانی چـەندین زانـای کـردووە، وە لـە (دار الحدیث) ماوەیـەك خزمـەتی زۆری فێرخـوازانی کـردووە، لـە ناوچـە جیـا جیاکـانی تریش خزمەتی کردووە، ئەم زانایە لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە[٣].

-( **عبدالمحسن بن الطوسي**)[٤]، کە ناسراوە بە (ابـن الطوسـي)، خـەڵکی شـاری (موسـڵ) بووەو فەرموودەناس و زانا بووە، لـە سـاڵی (٥٣٨ك/١١٤٣ز) هـەر لـە (موسـڵ) لـە دایـك بـووە، وتاربێـژبووە لـە مزگـەوتی(العتیق)، لـە خانەوادەیـەك بـووە، کـە شـارەزاییان هەبووە لە زانستە ئیسلامیەکان .

هەروەها ناوبراو دوای ئـەوەی هەنـدێ شارەزایی وەردەگـرێ لـە شـاری (موسـڵ) دواتر دەچێتە شاری (بەغدا)و ماوەیەك لەوێش خـەریکی وەرگرتنـی زانسـت دەبێـت لای زانایان، پاشان دەگەڕێتەوە شاری (موسڵ)و خزمەت بە قوتابیان دەکات و دەبێتە یـەکێك لـە زانـا دیارەکـانی سـەردەمی خـۆی، وە (ابـن الصـلاح) یـەکێك بـووە لـە قوتابیەکانی و ماوەیەك لای ئەو وانـەی خوێنـدووە، (عبدالمحسن الطوسي) لـە سـاڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز) کۆچی دوایی کردووە(٤).

**بغداد:-**

- (**ضیاء الدین، أبو أحمد عبد الوهاب ابن الشیخ الأمین أبـي منصـوْر علـي بـن علي بـن عبیْد الله ابْن سکیْنة البغدادي، الصوْفي، الشـافعي**)[٥]. ئـەم زانایـە شـارەزایەکی باشـی بواری (الفقه) بووە، وەهەروەها لە بواری فەرمودەناسیدا کەسێکی دیار و شارەزابووە، وە (ابـن الصـلاح) یـەکێك بـووە لـە قوتابیـەکانی؛ زانسـتی فـەرموودەی لا خوێنـدوە،

(١) الذهبي, سیر اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤٠.
(٢) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٦٩٩.
(٣) ابـن الصـلاح, ادب المفـتي والمسـتفتي, مقدمـة المحقـق, ص١٢؛ الصـفدي, الـوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦؛ الداوودی, طبقات المفسرين, ج١, ص٣٨٣.
(٤) ابـن الـدبيثي, ذيـل تـاريخ مدينـة السـلام, ج٤, ص٢٨٢؛ ابـن المسـتوفي, تـاريخ اربـل, ج٢, ص٦٩٧؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٥, ص٣٨٥.
(٥) الذهبي, تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٤٩؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢١, ص٥٠٢.

وههـەروەها كەسـێكی پێشـەنگ بـووە، وە بـە (شـيخ الاسـلام) ناسـراوبووەو خـاوەن رێزێكی زۆر بووە. وە ساڵی (٦٠٧ك/١٢١٠ز) كۆچی دوایی كردووە[١].

-(**عمربن محمد بن معمر بن يحيى**) ئەم زانایـە بـە (ابـى حفص بـن طبرزد البغـدادي) یش بەناوبانگ بووە [٢]، هەروەها نازناویكی تریشی هـەبووە، كە بـە(شـيخ الحـديث) ناسـراوە، كـە واتـە فەرموودەناسـێكی گـەورەو شـارەزا بـووە، وە (ابـن الصـلاح الشهرزوری) یـەكێك بـووە لـە قوتابیـەكانی ئـەم زانـا نـاودارە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر لێهـاتوویی و شـارەزایی ئـەم زانایـە، لـە سـاڵی (٥١٥ك/١١٢١ز) لـە دایـك بـووە. دواتـر دەچێتە (دیمەشق)و ماوەیـەك لـەوێ دەمێنێتـەوەو دواتـر دەگەڕێتـەوە بـۆ (بەغـدا)و دەست بە وانەگوتنەوە دەكات، لە ساڵی (٦٠٧ك/١٢١٠ز) كۆچی دوایی كردووە [٣].

-(**أبو القاسم عبد الكريم محمد بن عبد الكريم القزويني الشافعي**)[٤] یەكێك بووە لە زاناكـانی بـواری فەرمووودەناسـی، هـەروەها ئـەم زانایـە ناسـراوە بـە (عـالم العجـم والعرب) وە یەكێك بووە لە پێشەوا دیارەكان و زانستێكی زۆری هەبووە، یەكێك بووە لـە ماموسـتاكانی(ابن الصلاح الشـهرزوری)، وا گومـان بـراوە كـە لـە ولأتـانی (عجـم) هاوشێوەی نەبووە[٥]، ئەمە نیشانەی لێهاتوویی و زیرەكـی ئـەم زانایـە دەگەیـەنێ. وە

---

(١) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢١, ص٥٠٢.

(٢) ابـن النجـار البغـدادي, ذيـل تـاريخ بغـداد, ج٥, ص١١٨؛ الـذهبي, تـذكرة الحفـاظ, ج٤, ص١٤٩؛ الـزهبی, سـير اعـلام النـبلاء, ج٢١, ص٥٠٢؛ ابـن كـثير, البدايـة والنهايـة, ج١٣, ص٧٣.

(٣) الـذهبي تـاريخ الاسـلام, ج١٣, ص١٦٧؛ ابـن كـثير, البدايـة والنهايـة, ج١٣, ص٧٣؛ ابـن الصلاح و سراج الدين, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح, ص٢٠.

(٤) اليافعي, مراة الجنان, ج٤, ص٤٥.

(٥) ابـو زكريـا محيـي الـدين يحيـى بـن شـرف النـووي, تهـذيب الأسمـاء واللغـات, دار الكتـب العلمية, (بيروت –د.ت) ج٢, ص٢٦٤.

یەکێك لە نازناوەکانی بریتی بووە لە (امام الدین) [1]، لە ساڵی (٦٢٤ك/١٢٢٦ز) کۆچی دوایی کردووە [2].

**مرو:-**

-**(ابو المظفر فخرالدين عبدالرحيم بن ابى سعد بن محمد ابن منصور السمعاني المروزي الشافعي)**[3]، وەکو زۆر لە زاناکانی تر، سەرەتای خوێندنی لای باوکی بووە و ئەو یەکەم ماموستای بووە، دواتر زۆر لە ناوچەکانی تر گەڕاوە، بۆ وەدەست خستنی زانست و زانیاری[4]، هەروەها یەکێك بووە لە زانا شافعیەکان و موفتی و فەرموودەناس بووە، (ابن الصلاح) یەکێك بووە لە قوتابیەکانی و سوودی زۆری لێوەرگرتووە، لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) کۆچی دوایی کردووە [5].

**نیسابور:-**

- ( **أبي الفتح منصور بن عبدالمنعم ابن الفراوي**) [6] :- ئەم زانایە یەکێك بووە لەوانەی کە (ابن الصلاح الشهرزوري) گوێی لێگرتووەو وانەی لا خوێندووە، شارەزایی هەبووە

---

(١) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٢, ص٢٥٢؛ ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٢٦٦.

(٢) النووي, تهذيب الأسماء واللغات, ج٢, ص٢٦٤.

(٣) ابو سعد, التحبير في المعجم الكبير, تحقيق: منيرة ناجي سالم, رئاسة ديوان الأوقاف, (بغداد-١٩٧٥), ج١, ص٥٠٣ ؛ ابن عساكر, تاريخ دمشق, تحقيق: عمرو بن غرامة العمروي, دار الفكر, ج٥٦, ص٢٥٦؛ ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٣١٤.

(٤) ابن الجوزي, المنتظم في تاريخ الأمم والملوك, محقق: محمد عبد القادر عطا واخرون, دار الكتب العلمية, (بيروت- ١٩٩٢), ج١٧, ص٣٧.

(٥) ابو سعد, التحبير, ج١, ص٥٠٣؛ الذهبي, ميزان الاعتدال فى نقد الرجال, تحقيق: علي محمد البجاوي, دار المعرفة, (بيروت - ١٩٦٣), ج٢, ص٦٠٦؛ ابن حجر العسقلاني, لسان الميزان, تحقيق: دائرة المعرف النظامية, ط٢, مؤسسة الأعلمي للمطبوعات, (بيروت - ١٩٧١), ج٤, ص٦.

(٦) الذهبي, العبر, ج٣, ص١٦٦؛ محمد بن عبد الله (ابي بكر), ابن الناصر, توضيح المشتبه المشتبه في ضبط اسماء الرواة وانسابهم والقابهم وكناهم, تحقيق: محمد نعيم العرقسوسي, مؤسسة الرسالة, (بيروت- ١٩٩٣م), ج٥, ص١١.

لـه بـوارى فـەرموودەدا [1]، وە ئـەم زانايـە لـە سـاڵى (٦٠٨ك/١٢١١ز ) کۆچـى دوايـى کردووە[2].

-(**أبو الحسين المؤيد بن محمد بن علي الطوسي**)[3]، لـە بنەچەدا خـەڵکى (نیسابور)ەو لەسـاڵى(٥٢٤ك/١١٢٩ز) لـە دايـك بـووە[4]. وە يـەكێك بـووە لـە فەرموودەناسـە بەناوبانگەکان و شارەزايى زۆرى هەبووە لەو بارەوە؛ چەندين زانـاى گـەورە لاى ئـەو زانستى زۆريان وەرگرتـووە، يـەکيك لەوانـەش (ابـن الصلاح الشهرزورى) يـە، کـە لـە (نيسـابور) چـۆتە خزمـەتى وانـەى زانسـتى خوێنـدووە، وە لـە سـاڵى (٦١٧ك/١٢٢٠ز) کۆچى دوايى کردووە[5].

- (**أم المؤيد زينب بنت أبي القاسم عبد الرحمن بن الحسن بن أحمد بن سهل بن أحمد بـن عبدوس الجرجاني**)[6]، يەکێك بووە لە زانا گەورەکان، وە ناسراو بووە بـە (الشعرية)، هەروەها لە بنەچەدا خەڵکى (نيسابور)ە[7]. شارەزايى بوارى فەرموودەناسى بـووە، وە لە ساڵى (٥٢٤ك/١١٢٩ز) لە شارى (نيسابور) لە دايك بووە[8] ئەمە ئەوە دەردەخات؛ کـە لــەو ســەردەمیش ئــافرەتى زانــاى ديــار هــەبوون، فێرخــوازى زۆر ســووديان لێوەرگرتوون، لەوانەش (ابن الصلاح) کـە دەچێتە (نيسابور). ئـەم زانـا ئافرەتـە لـە ساڵى (٦١٥ك/١٢١٨ز) لە شارى (نيسابور) کۆچى دوايى دەکات [9].

---

(١) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.
(٢) ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٢٠٤.
(٣) ابـن الأبـار, محمد بن عبد الله بن ابي بكر القضـاعي البلنسـي, التكملة لكتـاب الصـلة, تحقيـق: عبـد السـلام الهـراس, دار الفكـر للطباعـة, (لبنـان– ١٩٩٥م), ج٢, ص١٤١؛ أبـو الفـداء, المختصـر في اخبـار البشـر, المطبعـة الحسـينية المصـرية, (د.م–د.س), ج٣, ص١٢٨.
(٤) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٥, ص٣٤٥.
(٥) ابن المستوفي, تاريخ اربل, ج٢, ص٢٠٦.
(٦) ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٢٢٦.
(٧) الذهبي, سير اعلام, ج٢٢, ص٨٥.
(٨) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٢, ص٣٤٥.
(٩) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٢, ص٣٤٥

- **(ابن الصفار، شهاب الدين أبو بكر القاسم بن أبي سعد)**[1] يەكێك بووە لە زانا هەرە دیارەكانی (خراسان)، كە زۆر شارەزایی هەبووە لەبارەی مەزهەبەكان و هەروەها شەرعزان (الفقیە) بووە، هەروەكو (سراج الدین) بە (شێخی خراسان) ناوی بردووە[2]، چل جار وانەی (الوسیط)ی ئیمام (غەزالی) بەشێوەی وانەی گشتی و تایبەتی خوێندووە، وە (ابن الصلاح) لە (نیسابور) یەكێك بووە لە قوتابیەكانی و وانەی زانستی وەرگرتووە، وە لە ساڵی (٦١٨ك/١٢٢١ز) لە (نیسابور) شەهید دەكری؛ لە كاتی هاتنی سوپای تەتارەكان بۆ نیسابور[3].
- **(محمد بن الحسن الصرام)**[4]، یەكێك بووە لە ماموستاكانی (ابن الصلاح)[5] وە ناسراوە بە حاجی (الصرام)، وە یەكیك بووە لە فەرمودە ناسە بەناوبانگەكان، كە رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە گێڕانەوی فەرموودەكان و زانایان پشتیان پێبەستووە[6].
-**(إسماعيل بن عثمان بن إسماعيل بن أبي القاسم بن أبي بكر)**[7]، ئەم زانایە خەڵكی (نیسابور) بووە، هەر بۆیەش ناسراو بووە بە (أبو النجیب القارئ النیسابوري)[8]،

---

(١) كمال الدين، ابن العديم، بغية الطلب فى تاريخ حلب، تحقيق: سهيل زكار، دارالفكر، ج٦، ج٦، ص٢٩٠٨؛ يوسف عبدالرحمن، ابوالحجاج، جمال الدين، تهذيب الكمال، ج٢٥، ص١٢.

(٢) مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح، ص١٨.

(٣) الذهبي، سير اعلام، ج٢٢، ص١١٠؛ ابن الصلاح و سراج الدين، مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح، ص١٩.

(٤) عبد الكريم بن محمد بن عبد الكريم، ابو القاسم الرافعي القزويني، التدوين في أخبار قزوين، تحقيق: عزيز الله العطاردي، دار الكتب العلمية، (د.م-١٩٨٧م) ج١، ص٢٦١.

(٥) الذهبي، سير اعلام، ج٢٣، ص١٤١.

(٦) القزويني، التدوين في اخبار قزوين، ج١، ص٢٦١.

(٧) الذهبي ، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٤٩٣.

(٨) الذهبي، سير اعلام، ج٢٣، ص١٤١.

هەروەها یەکێك بووە لە ماموستا دیارەکانی (ابـن الصلاح) لـە بـواری فەرمودەناسـی، ئەم زانایە لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) کۆچی دوایی کردووە[١].

-(أبي المعالي بن ناصر الأنصاري) ئەمەش یەکێکی ترە لەو زانایانەی، کە (ابن صلاح) لە (نیسابور) چۆتە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری، کە شەرعزان (فقیە) و موفتی بووە، لە ساڵی (٦٠٨ك/١٢١١ز) کۆچی دوایی کردووە [٢] .

**همذان:-**

-(أبو الفضل عبد الرحمن بن عبد الوهاب بن أبي زيد بن المعزم الهمذاني)[٣] ئەم زانایـە لە ساڵی (٥٢٦ك/١١٣١ز) لە دایـك بـووە و یـەکێك بـووە لـە فەرمـوودەناسـە ناودارەکـان، سـەرەتای وەرگرتنـی زانسـت لای بـاوکی خوێندویـەتی و پاشـان دەچـێتە لای چـەند زانایـەك، لەوانـەش:- (أبـي جعفـر محمـد بـن أبـي علـي الحـافظ، ونصـر بـن المظفـر البرمکـي) وە هـەروەها بـاپیری (ابوالفضـل)، کـە نـاوی (ابـي زیـد)[٤] بـووە نیمـامی مزگەوتی (همذان) بووە[٥].

یەکێك بـووە لـە مامۆسـتاکانی (ابـن الصلاح)، وە زانـاو پێشـەوایەکی بـەناوبانـگ بووە، ناسراو بـووە بـە ئەمانەتـداری و پـاکی و جێـی متمانـەبووە؛ خـاوەن دیانـەت و ئاکاری بەرزبووە [٦] وە هەروەها لە ساڵی (٦٠٩ك/١٢١٢ز) کۆچی دوایی کردووە [١].

---

(١) الذهبي تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٤٩٣.

(٢) الـذهبي, سـير اعـلام, ج٢٣, ص١٤١؛ ابـن الصـلاح و سـراج الـدين, مقدمـة ابـن الصـلاح ومحاسن الاصطلاح, ص١٧.

(٣) ابن المستوفي, تاريخ اربل, ج٢, ص٤٢٢؛ الذهبي, تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٢٣؛ الصفدي, الصفدي, الوافي باوفيات, ج١٦, ص١٤٥.

(٤) (ابو زيد صالح بن محمد بن علي بن محمد بن علي بن عبد الله بن المعزم الهمـذاني) وە زانا وشێخێکی دیاری سەردەمی خۆی بووە, وە نیمامی مزگەوتی (همـذان)بووە لـە سـاڵی (٥٣٣ك/١١٣٨ز) کۆچی دوایی کردووە, ابو سعد (المنتخب من معجم شيوخ السمعاني, تحقيـق: موفـق بـن عبـد الله بـن عبـد القـادر, دار عـالم الكتـب, (الريـاض- ١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م), ج١, ص٩٠٧.

(٥) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٣, ص٢١٦.

(٦) ابو الفداء زين الدين قاسم, الثقات ممن لم يقع في الكتب الستة, ج٦, ص٢٧٥.

**حران :-**

-**(ابي محمدبن عبد القادر بن عبد الله بن عبد الرحمن أبو محمد)**:- ئەم زانایە لە ساڵی (٥٣٦ك/١١٤١ز) لە دایك بووە، هەروەکو (ابـن کـثیر)باسـی کـردووە و دەڵێـت:- (الحافظ المحدث المخرج المفید المحرر المتقن البارع المصنف)[٢]، یەکێك بـووە لـە فەرمووودەناسـە دیارەکـان و ماوەیـەك لـە (موسڵ) بـووە لـە (دار الحـدیث) کـاری کـردووە و پاشـان دەچێتە (حران) و لەسەر دەستی چەند زانایـەك زانستە ئیسلامیەکان دەخوێنێـت، (ابن الصلاح) یـەکێك بووە لـە قوتابیـەکانی و زنیـاری زۆری لێـوەردەگرێ، لـە سـالی (٦١٢ك/١٢١٥ز) کۆچی دوایی کردووە[٣].

**دمشق:-**

- **(فخر الدین، أبو منصور عبد الرحمن بن محمد بـن الحسـن بـن هبـة الله بـن عبـد الله الدمشـقي، الشـافعي)**[٤] ناسـراوە بـە (ابـن عسـاکر) [٥]، وە ئـەم زانایـە لـە سـاڵی (٥٥٠ك/١١٥٥ز) لە دایك بووە [٦]، هـەروەها پێگەیشتووە لەسـەر دەسـتی (الشـیخ قطـب الدین أبي المعالي مسعود النیسابوري) بەشێوەیەکی زۆر جوان باسـی لێـوەکراوە وەکو (الذهبي) بەو شێوەیە باسی کردووە (الشیخ، الإمام، العالم، القدوة، المفتي)[٧].

هـەروەها لـە زۆر لـە قوتابخانـەکانی ئەوسـەردەم وانـە گوتۆتـەوەو شـارەزایی هەبووە لە (فقـه)، وە هـەروەها یـەکێ بـووە لـە شـێخی شـافعیەکان [٨]، ماوەیـەك لـە قوتابخانـەی (الصـلاحیة) لـە (قـودس) وانـەی گوتۆتـەوە، هـەروەها یـەکێك بـووە لـە

---

(١) ابن المستوفي, تاریخ اربل, ج٢, ص٤٢٢؛ الذهبي, تاریخ الاسلام, ج١٣, ص٢١٦

(٢) الـذهبي, سـیر اعـلام, ج٢٣, ص١٤١؛ الـذهبي, تـذکرة الحفـاظ, ج٤, ص١٤٩؛ البدایـة والنهایة, ج١٣, ص٦٩.

(٣) ابن کثیر, البدایة والنهایة, ج١٣, ص٦٩.

(٤) الذهبي, سیر اعلام النبلاء, ج٢٢, ص١٨٧؛ ابن کثیر, البدایة والنهایة, ج١٣, ص١٠١.

(٥) ابن خلکان, وفیات الاعیان, ج٣, ص١٣٥.

(٦) ابن کثیر, البدایة والنهایة, ج١٣, ص١٠١.

(٧) الذهبي, سیر اعلام النبلاء, ج٢٢, ص١٨٧.

(٨) ابن الصلاح و سراج الدین, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح, ص٢٢.

ماموّستاكانى (ابن الصلاح)، وه له قوتابخانەى (التقوية) له (ديمەشق)وانەى گوتۆتەوه، زانايەكى پايەبەرز بووه لەسەردەمەكەى خۆيدا، چ له ڕووى زانستيدا و چ له ڕووى دينداری و خێرخوازيدا [1].

پاشان دەچێتە (حران)، وه لەساڵى (٦٢٠ك/١٢٣٢ز) كۆچى دوايى كردووه [2]، وههەروەها (**ابن خلكان**) **دەڵێت**:- ((چەند جارێك سەردانى گۆرەكەم كردووه له گۆڕستانى (الصوفية) له (ديمەشق)) [3].

-(**موفق الدين ، أبومحمد عبد الله بن أحمد بن محمد بن قدامة بن مقدام بن نصر المقدسي**): له ساڵى (٥٤١ك/١١٤٦ز) له دايك بووه [4]، هەروەها يەكێك بووه له ماموستاكانى (ابن الصلاح الشهرزورى)، چەندين ناوچەى جيا جيا گەڕاوه لەگەڵ خانەوادەكەى، هەروەها توانيويەتى هەموو قورئان لەبەر بكات و شارەزايى زۆرى پەيدا كردووه له بوارى زانستى قورئاندا [5].

هەروەها (ابن الصلاح) زۆر بە بايەخەوه باسى ڕۆڵ و گەورەيى ئەم زانايەى كردووه لەبارەيەوە دەڵێت:- ((نەمبينيوه نموونەى شيخ موفق)) [6]، ئەم زانايە خاوەن پلەو پايەيەكى زانستى گەورە بووه و نموونە وپێشەنگ بووه [7]، هەروەها لەساڵى (٥٧٣ك/١١٧٧ز) دەچێتە حەج، وەخاوەن چەند فتوايەيك بووه، دەريايەك بووه له هونەرو بوارە جۆربەجۆرەكان [8]، هەروەها پياوێكى خاكى و خواناس و

---

(١) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص١٣٥.

(٢) الذهبي, سير اعلام, ج٢٢ن ص١٨٧-١٨٨.

(٣) خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص١٣٥.

(٤) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, ص٢٢؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٩٩.

(٥) الذهبي, سير اعلام, ج٢٢ن ص١٦٥.

(٦) ابن الصلاح و ابن الصلاح و سراج الدين, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح, ص٢٢.

(٧) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, ص٢٢.

(٨) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢٢.

دونیانەویست بووە، وە لە (بەغدا) شارەزایی لە مەزهەبی (ئەحمەدی) وەرگرتووە[1]، وە هەروەها لە لەساڵی (٦٢٠ك/١٢٢٣ز) کۆچی دوایی کردووە، بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر تەرمەکەی بە خاك دەسپێردرێ[2].

-(**جمال الدين، أبو القاسم عبد الصمد بن محمد بن أبي الفضلِ بنِ علي بن عبد الواحد الأنصاري**)[3]، (**الحرستاني**)[4]، وە ئەم زانایە لە ساڵی (٥٢٠ك/١١٢٦ز) لە (دیمەشق) لە دایك بووە(٥). یەکێك بووە لە زانا دیارو بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، هەروەها (قاضي القضاة) بووە لە (دیمەشق)، (واتە پلەو پایەیەکی تایبەتی هەبووە لەو سەردەمەدا)، ئەمەش پێگەی ئەم زانایە دەردەخات[6]، یەکێك لە ماموستاکانی (ابن الصلاح)بووە، بەردەوام لە کۆڕی زانایان بووە، گوێی لە فەرموودە گرتووەو سەرجەم نوێژەکانی لە مزگەوت بە کۆمەڵ ئەنجام داوەو یەکێك بووە لە زاناگەرەکانی

(١) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٩٩.

(٢) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢٢؛ ابن كثير, البداية والنهاية, والنهاية, ج١٣, ص٩٩.

(٣) اليعمري , عيون الأثر في فنون المغازي والشمائل والسير, تعليق: إبراهيم محمد رمضان, دار القلم, (بيروت-١٩٩٣), ج١, ص٥٦؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٧٧؛ أبو عبد الله, جمال الدين ابن حديدة, المصباح المضي في كتاب النبي الأمي ورسله إلى ملوك الأرض من عربي وعجمي, تحقيق: محمد عظيم الدين, عالم الكتب, (بيروت-د.س) , ج٢, ص٢٣١.

(٤) (حرستا):گوندیکی گەورەی ئاوەدانە سەر بە (دمشق) ە دەکەوێتە سەر ڕێگای (حمص) نێوان ئەو و دمشق زیاتر لە فەرسەخێکە, ياقوت الحموي, معجم البلدان, ج١, ص٤١٧.

(٥) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٢, ٨٠؛ الذهبي, العبر, ج٣, ص١٦٣؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٧٨؛ المقريزي, السلوك لمعرفة دول الملوك, حقق: محمد عبد القادر عطا, دار الكتب العلمية, (بيروت- ١٩٩٧م), ج١, ص٣٠٨؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص٢٩٥.

(٦) ابن الصلاح و سراج الدين, مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح, ص٢٢.

مەزهـەبی (شـافعی)و کەسـێکی دادپـەروەر بـووە[1]. هـەروەها زۆر شـوێن گـەڕاوەو سەردانی زۆر زانـای گـەورەی کـردووە؛ خزمـەتی گـەورەی کـردووە بـە فوتابیـەکان و شارەزاییێکی زۆری هـەبووە لـە بـواری فەرمودەناسـیدا. خـاوەن ئیمـان و دینداریـەکی باش بوو، وە خاوەن توانایەکی زۆر بـووە و شـێوەیەکی جـوانی هـەبووە[2]. هـەروەها خزمەتی (دار الحدیث)کـردوەو لەگـەڵ ئەوەشـدا وتاربێـژیکی بـەناوبانگی (دیمەشـق) بووە، وە لە ساڵی (٦١٤ك/١٢١٧ز) کۆچی دوایی کردووە[3].

**حلب:-**

- (**زين الـدّين أبـو محمـد عبـد الله بـن عبـد الـرحمن بـن عبـد الله بـن علـوان الأسـدي الشـافعي**)[4]، ناسراوە بە(ابن الأستاذ)[5] یـەکێك بـوو لـە زانـا و قازیـە بەناوبانگـەکانی (حەلەب) ناسراو بوو بە (قاضي حلـب)[6]، وە شـارەزایەی هـەبووە لـە (فقـە)، وە بـە (ابن الاستاذ) بەناوبانگ بووە[7]. کتێبێکی گرنگی هەیە بەناوی (شرح الوسیط) خۆی لە دە بەرگ دەبینێتەوە[8]، هەروەها یەکێك بووە لـە ماموسـتاکانی (ابـن الصـلاح) لـە

---

(١) ياقوت الحموي, معجم البلدان, ج٢, ص٢٤١؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٧٧؛ ابـن نقطـة الحنبلـي البغـدادي, التقييـد لمعرفـة رواة السـنن والمسـانيد, تحقيـق: كمـال يوسف الحوت, دار الكتب العلمية, (بيروت-١٩٨٨م), ج١, ص٣٨١.

(٢) النعيمي الدمشقي, الدارس فى تاريخ المدارس, ج١, ص٢٩٥.

(٣) ياقوت الحموي, معجم البلدان, ج١, ص٤١؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٢, ٨٠؛ ابو الفداء, الثقات ممن لم يقع في الكتب الستة, ج٦, ص٣٦١.

(٤) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٤, ص١٧٤؛ ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة, ج٦, ص٣٠١.

(٥) اليونيني, ذيل مرآة الزمان, ج٢, ص٥؛ الذهبي, العبر في خبر من غبر, ج٣, ص٢٢٢.

(٦) ابـن تغـري بـردي, النجـوم الزاهـرة, ج٦, ص٣٠١؛ ابـن العمـاد, شـذرات الـذهب, ج٧, ص٢٩٩؛ ابن العديم, بغية الطلب فى تاريخ حلب, ج٤, ص١٨٨٤.

(٧) الذهبي, العبر في خبر من غبر, تحقيق: ابو هاجر محمد السعيد بن بسيوني زغلول, دار الكتب العلمية, (بيروت-د.س) ج٣/ص٢٢٢؛ جلال الدين السيوطي, حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١, ص٤١٤.

(٨) السيوطي, حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة, ج١, ص٤١٤.

لای زانستی شەرعی خوێندووە[1]. لە تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا لە ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ز)، کۆچی دوایی کردووە [2]. جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بکەین؛ کە ناوی چەندین زانای تر هاتوون لە سەرچاوەکان، کە(ابن الصلاح الشهرزوری) سوودی لێوەرگرتوون، یاخود وانەی لا خوێندون؛ بەلأم تەنها ئەماژە بەناوەکانیان کراوە، لەسەرچاوەکاندا، تیشك نەخراوەتە سەر وردەکاری لەسەر ژیان و ڕۆڵیان، لەوانە (محمود علی الموصلی)[3]، هەروەها لە شاری (مرو) ئاماژە بەم دوو زانایەش کراوە (محمد بنِ عمر المسعودي)[4]، ( أبي جعفر محمد بن محمد السنجي)[5] و چەندانی تر.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە (ابن الصلاح) لە هەر ناوچەیەك سەردانی چەندین زانا و مامۆستای کردووە، چاوی پێکەوتوون لە نزیکەوە بەمەبەستی وەرگرتنی زانستە جۆراوجۆرەکان، لە هەریەك لەمانە جۆرە زانست و ئەزموونێکی وەرگرت، ئەمەش کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر فراوانکردنی ئاستی زانستی و ڕوشنبیری (ابن الصلاح)و بەرەو پێش چوونی لەو ڕوانگەوە.

## تەوەرەی دووەم :- قوتابیەکانی (ابن الصلاح الشهرزوری):-

دوای هەوڵ و ماندوبونێکی زۆرو بێ وچان؛ بە مەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری، (ابن الصلاح) زۆربەی ناوچە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامی دەگەڕێت و چاوی بە کۆمەڵێك زانای دیارو بەناوبانگی ئەو سەردەم دەکەوێ، ئەمەش دەبێتە مایەی پێگەیشتن و تێگەیشتن و دەرکەوتنی لە بواری زانستیدا. هەر بۆیە زۆرێك لە قوتابیان بەهۆی لێهاتوویی و ناوبانگی (ابن الصلاح) دێنە لای و دەبنە قوتابی و سوود لەو هەموو زانست و زانیاریانە وەردەگرن؛ کە (ابن الصلاح) ماوەیەکی زۆری

---

(١) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.

(٢) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٧, ص٢٩٩.

(٣) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤٠؛ الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٠, ص٢٦.

(٤) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص٣٢٦.

(٥) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٤, ص٤٥٥.

تەمەنی خەریکی گەڕان و سوڕان بوو بە دوایاندا، لە ناوچە و شوێنە جیاجیاکاندا. هەر بۆیە لێرەدا ئاماژە بە گرنگترین ئەو فوتابیانەی دەکەین؛ کە لە سەرچاوەکان باسیان لێوەکراوە.

١/ **أحمد بن محمد بن إبراهيم بن خلكان قاضي القضاة شمس الدين أبو العباس**[١] **الإربلي الشافعي**[٢]، لە ساڵی ( ٦٠٨ك/ ١٢١١ز) لە شاری (اربل) واتە (هەولێر) لە دایك بووە[٣]، لە زۆر بەی سەرچاوەکان بە(القاضي القضاة شمس الدين ابن خلكان) ناسراوە(٤)، ئەمەش دوای ئەوەی لە لایەن (الظاهر بيبرس)[٥]ەوە لە ساڵی (٦٥٩ك/ ١٢٦٠ز)، کراوە بە (قاضي القضاة) لە وڵاتی شام[٦]، بەڵام زیاتر بە (ابن خلكان)ناسراوبوو، بەوناوە بەناوبانگ بوو[٧]. ئەم زانایە لە (هەولێر) گەورە بووە لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیرو زانستخواز پەروەردەبووە، کە خاوەنی ناوبانگی گەورە

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١؛ الذهبي، العبر، ج٣، ص٣٤٧؛ العمري، مسالك الابصار في ممالك الامصار، ت:كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، (بيروت-٢٠١٠)، ج٦، ص٢١٩.

(٢) ابن الشعار، قلائد الجمان، تحقيق: كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، (بيروت-٢٠٠٥)، ج١، ص٣٤٥؛ المقريزي، المقفى الكبير، تحقيق: محمد اليعلاوي، دار الغرب الاسلامي، (بيروت -١٩٩١)، ج١، ص٦١٥.

(٣) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ ابن خلكان ، وفيات الاعيان، ج٢، ص٣٤٤.

(٤) اليونيني، ذيل مراة الزمان، ج١، ص١٤٤؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٠١.

(٥) (الظاهر بيبرس): ناوی بيبرس بن عبدالله، ركن الدين ابوالفتوح الصالحی، لە ساڵی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز) لە قەبجان لە دایك بووە لە شەری (عين جالوت) توانی (ملك قطن) بكوژێ وە تەتەرەکان دەشکێن و دەبێتە حوکمرانی مصر و شام، الكتبي ، فوات الوفيات، تحقيق: إحسان عباس، دار صادر، (بيروت-١٩٧٣)، ج١، ص٢٣٥.

(٦) الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٩.

(٧) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٢، ص٩٢٠؛ ابن الوردی، تاريخ ابن الوردی، دار الكتب العلمية، (بيروت-١٩٩٦)، ج١، ص١٣٧؛ ابن خلدون، ديوان المبتدا والخبر، تحقيق: خليل شحادة، دار الفكر، (بيروت-١٩٨٨، ج٥، ص٢٨٥.

بوونە لە بواری ئایینی، زانای گەورەیان تێدا هەڵکەوتبوو، ئەمەش کاریگەری زۆری لەسەر دروست کردبوو[1].

(ابن خلكان ) لە (هەولێر)و چەندین ناوچەی تر گەڕاوە؛ چۆتە لای زۆر لە زانا و مامۆستایانی ئەو کات، لە (موسل)و (حلب)و (دیمەشق)و (قاهیرە)و زۆر شوێنی تر گەڕاوە؛ مەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری، هەر لە تەمەنی بچوکیدا توانی ئیجازەی زانستی وەربگرێت لای چەند زانایەك لەوانەش (زينب بنت الشعري، رضى الدين النيسابوري، المؤيد الطوسي) و چەندان زانای تری ئەو کات[2].

یەکێك لەو سەرچاوە سەرەکیانەی، کە مێژووناسان و زانایان سوودی زۆریان لێوەرگرتووە بریتیە لە کتیبەکەی بەناوی (وفيات الاعيان)[3]، کە سەرگوزشتەی زۆر لە زانایان و کەسانی ناوداری مێژووی ئیسلام تێدایە، تەنانەت (ابن خلكان) ئەوەندە پەرۆش و سەرسام بووە بە(ابن الصلاح)، کە یەکێك بووە لە ماموستاکانی سەرگوزشتەیەکی تایبەتی بۆ مامۆستاکەی داناوە[4].

هەروەها لە بارەی (ابن الصلاح)ەوە دەڵێت:- ((كان أحد فضلاء عصره في التفسير والحديث والفقه وأسماء الرجال، وما يتعلق بعلم الحديث ونقل اللغة، وكانت له مشاركة في فنون عديدة، وكانت فتاويه مسددة))[5]. واتە یەکێك بووە لە زانا ناودارەکانی سەردەمی خۆی لە تەفسیرو فەرموودەو شەرع و ناوی پیاوان و ئەوەشی،

---

(١) ابن تغري بردي, النجوم الزاهرة, ج٧, ص٣٥٤؛ بەهار عەباس جبرائيل, کوردە زەرزاریەکان ڕۆڵی ڕامیاری و شارستانیان لە هەردوو سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی, ماستەرنامەی بلاونەکراوە, پێشکەشە بە کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان, زانکۆی کۆیە, (کۆیە-٢٠١٠), ل١١.

(٢) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٢, ص٣٤٤؛ الكتبي , فوات الوفيات, ج١, ص١١٠؛ ابن تغري بردي, المنهل الصافي والمستوفى بعد الوافي, تحقيق: محمد محمد امين, الهيئة المصرية العامة للكتاب, (د.م- د.س) ج٢, ص٩٣.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢١

(٤) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٥) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج١, ص٣, ابن العماد, شذرات الذهب, ج١, ص٥٧.

كە پەیوەندی بە زانستی فەرموودە هەبێت. وە بەشداری لە زۆر بواری هونەریدا هەبووە، فتواکانیشی پێکراو بوونە[1]، (ابن خلكان )لە ساڵی ٦٨١ك/١٢٨٢ز) کۆچی دوایی کردووە.

٢ / (**عبد الرحمن بن نوح بن محمد شمس الدين التركماني المقدسي الدمشقي**)[2] لە ساڵی (٥٩٧ك/١٢٠٠ز) لە دایك بووە، یەکێك بووە لە قوتابیەکانی (ابن الصلاح) زۆر سوودی لێوەرگرتووە بەتایبەتی لە بواری فەرموودەدا[3]. ماوەیەك لە قوتابخانەی (الرواحية) وانە بێژ بووە [4]، زانایەکی دڵسۆزو بەهەیبەت و ویقاربوو، وەهەروەها موفتی (دیمەشق) بووە. وە ساڵی (٦٥٤ك/١٢٥٦ز) لە (دیمەشق) کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی (الصوفية) بەخاك سپێردراوە[5].

٣- (**كمال الدين أبو الفضائل سلار بن الحسن بن عمر الإربلي**)[6]، یەکێك بووە لە قوتابیەکانی (ابن الصلاح) سوود و زانستی زۆری لێوەرگرتووە؛ بە تایبەتی لە بواری فەرموودەدا[7] .

یەکێك بووە لە زانا پێشەنگەکانی سەردەمی خۆی؛ رۆڵی گەورەی هەبووە لە چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی سەردەمی خۆی[8]، هەروەها موفتی شام بووە[9].

---

(١) وفيات الاعيان ج٣, ص٢٤٣.

(٢) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٨٨؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٥.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٢١.

(٤) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٥, ص٢٦٤.

(٥) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢١؛ البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٥؛ ابو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي, تهذيب الأسماء واللغات, ج١, ص١٨.

(٦) ابن المستوفي, تاريخ اربل, ج٢, ص٢٥٦.؛ النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص١٦.

(٧) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.

(٨) ابو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي, تهذيب الأسماء واللغات, ج١, ص١٨.

(٩) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢٢.

دوای هەوڵ و ماندوبونێکی زۆرو وەرگرتنی زانستێکی بەرفراوان و خزمەتێکی گەورە، دواجار ئەم زانایە لە ساڵی (٦٧٠ك/١٢٧١ز) کۆچی دوایی کرد[١].

٤/ (**كمال الدين أبو إبراهيم إسحاق بن أحمد بن عثمان المغربي**)[٢]، یەکێك بووە لە زانا گەورەکانی مەزهەبی شافعی، سەرەتای خوێندن و وەرگرتنی زانستی لەلای شێخ فخرالدین(ابن عساكر) بووەو دوای ئەویش لای (ابن الصلاح الشهرزوری) بووە، وە یەکێك بووە لە زاناو پێشەوا پایەبەرزەکانی سەردەمی خۆی. ماوەی بیست ساڵ لە قوتابخانەی (الرواحية) دەمێنێتەوەو سوودی زۆر وەردەگرێ(٣).

ئیمامی (النووي) باس لە هەندێ خەسڵەت و تایبەتمەندی ئەو پیاوە دەکات بەمشیوە:- (شيخى الإمام المتفق على علمه، وزهده، وورعه، وكثرة عبادته، وعظم فضله)[٤]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ زانایەکی پایەبەرزو دونیا نەویست و پارێزکارو زیرە و لێهاتوو بووە.

یەکێك بووە لەو زاناو شەرعناسانەی، کە بەناوبانگ و ناسراو بووە بە زانست و کردار (العلم)و (العمل). توانای پێشڕەوی کردنی خەڵکی هەبووەو دەستێکی باڵای هەبوو لە کرداری چاکە و حەزی لە ئاسانکاری بووە، کەسێکی تەواو بۆخوا سوڵحاوبوو، ویرد و یادی خوای زۆر کردووە[٥]. دواجار ئەم زانا بەناوبانگ و پایەبەرزە لە ساڵی (٦٥٠ك/١٢٥٢ز) کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی (الصوفية) لە بەرامبەر گۆڕی مامۆستاکەی( ابن الصلاح الشهرزوری) تەرمەکەی دەنێژرێ[٦].

---

(١) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص١٤٩.

(٢) الذهبي, سير لعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.

(٣) ابن كثير, البداية والنهاية, ج٥, ص٢١٣.

(٤) أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي, تهذيب الأسماء واللغات, ج١, ص١٨.

(٥) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٠٢.

(٦) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٢٢؛ ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٠٣.

٥/(عمر بن بندار بن عمر بن علي القاضي أبو الفتح كما الدين التفليسي)[١]، يەكێكە لە زانا هەرە بەناوبانگەكان؛ لە شاری (تفليس)[٢] لە ساڵی(٦٠١ك/١٢٠٤ز) لەدایك بووە[٣]؛ بەڵام هەندێكی تر پێیان وایە لەساڵی(٦٠٢ك) لە دایك بووە[٤]. وە زانایەكی (اصول)ی گەورە بوو، هەروەها وانەی خوێندووەو فتوای وەرگرتوە، گوێی لە فەرمووده گرتووە، لە كۆڕە زانستیەكانی (ابن الصلاح ) دانیشتووە[٥].

دواتر دەبێتە قازی لە (دیمەشق)و لەگەڵ هاتنی تەتەرەكان بۆ ناوچەكانی (شام)و (مصر)و دەستبەسەر داگرتنی ناوچەكە (التفليس)، ڕاستەوخۆ دەچێتە لای ئەوان و ئامۆژگاریان دەكات؛ كە مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكی باش بێت و خوێن نەڕێژرێت، ئەوانیش دیارە قسەی ئەویان ڕەتنەدەكردەوە[٦]، دواتر ڕاستگۆ نەبوون لەگەڵ (ابن بنداري) و تۆمەتیان بۆ دروست كردون، ناچاریان كرد؛ كە كۆچ بكات بۆ (قاهیره)و لەوێش خەڵك سوودی زۆریان لێوەرگرتووەو بەتایبەتی لە( اصول الفقه) وە یەكێك بوو لە زاناو پێشەوا پایەبەرزەكان[٧]. ئەم زانایە لە ساڵی (٦٧٢ك/١٢٧٣ز) لە شاری (قاهیره) كۆچی دوایی كرد[٨].

---

(١) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص٣٠٩.

(٢) تفليس: شارێكی گەورەی خۆش و گەشتیاریە خاكێكی بە پیت وبەرەكەت و ئاوەدانە, وە رووبارێك بە ناوەراستیدا دەروات ئاوی بەردەوام گەرمە, مجهول, حدود العالم من المشرق إلى المغرب, تحقيق ومترجم الكتاب (عن الفارسية): السيد يوسف الهادي, الدار الثقافية للنشر, (القاهرة-١٤٢٣هـ), ج١, ص١٦٧.

(٣) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٢٦٧.

(٤) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٤٣.

(٥) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٢٢؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ج٨, ص٣٠٩.

(٦) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص٣٠٩.

(٧) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٤٣؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٢٦٧.

(٨) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٢٢؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج٨, ص٣٠٩.

٦/(**شمس الدين أحمد بن علي بن الزبير بن سليمان القاضي الجيلي الدمشقي الشافعي الشاهد الصوفي**)، يەكێك بووە لەو كەسانەی؛ كە گوێی لە وانەكانی (ابن الصلاح) راگرتووە، (واتە قوتابی ئەو بووە)، لە بواری فەرمووددا، وە لە ساڵی (٧٢٤ك/١٣٢٣ز) كۆچی دوایی كردووە[١].

٧/(**زين الدين إسماعيل بن عثمان بن محمد بن عبد الكريم الحنفي**)، لە ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز) لە دایك بووە[٢]، هەروەها بە (ابن المعلم) ناسراو بووە[٣]، یەكێك بووە لە زانا (شیخ)ە گەورەكانی مەزهەبی حەنەفی[٤]، وە قوتابی( ابن الصلاح )بووەو سوودی زۆری لێوەرگرتووە لە بواری (الفقه)، وە دەبێتە یەكێك لە زانا هەرە دیارو بەناوبانگەكانی بواری شەرعزانی (الفقه)و فتوادان، خاوەنی زانستێكی زۆرو بوو، زاهیدو دونیانەویستێكی كەم وێنەبوو[٥] دواتر دەچێتە (قاهیرە). هەروەها ماوەیەك

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٢٢.

(٢) الصفدي, اعيان العصر واعوان النصر, تحقيق: الدكتور علي ابو زيد, الدكتور نبيل أبو عشمة واخرون, دار الفكر المعاصر, (بيروت –١٩٩٨ م), ج٥, ص٤٣١؛ ابن تغري بردي, المنهل الصافي والمستوفى بعد الوافي, ج٢, ص٣٩٨.

(٣) الذهبي, اسماء من عاش ثمانين سنة بعد شيخه او بعد سماعه, تحقيق: عواد الخلف, مؤسسة الريان, (د.م– ١٩٩٧ م) , ج١, ص١٠٧؛ الذهبي, العبر, ج٤, ص٣٨؛ ابن حجر العسقلاني, الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة, تحقيق:محمد عبد المعيد ضان, مجلس دائرة المعارف العثمانية – صيدر اباد, (الهند– ١٩٧٢م), ج٦, ص٤٥.

(٤) ابن تغري بردي, المنهل الصافي والمستوفى بعد الوافي, ج٢, ص٣٩٨؛ ابن العماد, شذرات شذرات الذهب, ج٨, ص٦١؛ السيوطي, بغية الوعاة في طبقات اللغويين والنحاة, تحقيق: محمد أبو الفضل إبراهيم, المكتبة العصرية, (صيدا–د.س) ج١, ص٤٥١.

(٥) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٤, ص٧٢.

بەر لە مردنی بارودۆخی تیك دەچێت و دادەروخێ [1]. هەر لە (مصر) لە ساڵی (٧٢٤ك/١٣٢٣ز) کۆچی دوایی دەکات[2].

٨/(**زين الدين أبو محمد عبد الله بن مروان بن عبد الله بن فيروز الفارقي**)[3] وە ئەم زانایە لە ساڵی(٦٣٣ك/١٢٣٥ز) لە دایك بووە[4]، یەکێك بووە لە زاناو پێشەواکانی مەزهەبی (شافعی)، قوتابی (ابن الصلاح الشهرزوری) بووەو شارەزایی لە بواری فەرمووودەناسیدا هەبووە، لە چەندین شوێن و قوتابخانە وەکو مامۆستا وانەی گوتۆتەوە، لەوانەش لە (دیمەشق) لە (دارالحدیث)و هەروەها لە قوتابخانەی (الشامیة)و چەندین شوێنی تر، بەردەوام بووە لە خزمەت کردن و کارکردن و بڵاوکردنەوی زانست و زانیاری وە بە (خطیب دمشق) ناسراو بووە[5].

هەروەها یەکێك بووە لە زانا پاك و پیشەنگەکان لە بواری زانستی و پەرستش و کاری چاکدا[6]، هەروەها زانایەکی ورەبەرزو بە هەیبەت و دامەزراو بووە؛ خوی بۆ زانست و زانیاری و کاری چاك یەکلا کردبۆوە، ماوەیەکی زۆریش خەریکی کاری

(١) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٨, ص٦١.

(٢) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٢٢؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٨, ص٦١.

(٣) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص٢١٥؛ عبد القادر بن محمد النعيمي الدمشقي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص٢٠؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٨, ص١٦.

(٤) الاسنوي, طبقات الشافعية, ج٢, ص ٢٩٢؛ عبد القادر بن محمد النعيمي الدمشقي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص٢٠؛ ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص٢١٥؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج١٠, ص٤٤.

(٥) ابن العماد, شذرات الذهب, ج٦, ص٧.

(٦) السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج١٠, ص٤٤

فتـوادان بـووه[1]، وه يـەكێك بـووه لـه قوتابيـەكانى (ابـن الصـلاح)[2]، لـه سـاڵى (٧٠٣ك/١٣٠٣ز) شيخ زين الدين كۆچى دوايى كردووه[3].

٩/(**ناصرالدين محمد بن يوسف بن مُحَمَّد بن عبد الله المصري الدمشقي**)[4]، وه بـه (ابـن المهتار) بەناوبانگ و ناسراوبووه[5]، له ساڵى (٦٣٧ك/١٢٣٩ز) لـه دايـك بـووه[6]. يـەكێك بـووه لـه قوتابيـەكانى(ابن الصـلاح)و گـوێى لـه وانـەكانى گرتـووه[7]. ئـەم زانايـه فەرمووده‌ناسێكى بـەناوبانگ بـووەو خزمـەتى زۆرى كـردووه لـه (دار الحـديث)، كـه فەرمووده‌ى خوێندۆتەوه[8]، وه هەروەها خـەڵكێكى زۆر گوێيـان لێگرتـووەو سـوودى زۆريان وەرگرتووه له ڕێگەى نوسينەكانى، كه نوسەرێكى لێهاتوو بـووه، وه لـه بـوارى ئـەدەبيش شـارەزايى باشـى هـەبووه[9]، دواجـار ئـەم زانايـه لـه (ديمەشـق) لـه سـاڵى (٧١٥ك/١٣١٥ز) كۆچـى دوايـى كـردووه، وه بـه ئامـادەبوونى خـەڵكێكى زۆر بـه خـاك سپێردراوه[10].

---

(١) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٤

(٢) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٢٣.

(٣) الاسنوي, طبقات الشافعية, ج٢, ص ٢٩٢؛ السبكي, طبقات الشافعية الكبرى, ج١٠, ص٤٤؛ ابن العماد, شذرات الذهب, ج٦, ص٧.

(٤) الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٤, ص٢٦٠؛ الصفدي, اعيان العصر واعوان النصر, ج٥, ص٤٥٦؛ ابن حجر العسقلاني, الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة, ج٦, ص٦٩؛ محمد بن أحمد بن علي, تقي الدين, أبو الطيب المكي الحسني الفاسي, ذيل التقييد في رواة السنن والأسانيد, تحقيق: كمال يوسف الحوت, دار الكتب العلمية, (بيروت–١٩٩٠م), ج١, ص١٣٣.

(٥) الذهبي, المعين في طبقات المحدثين, تحقيق: د. همام عبد الرحيم, دار الفرقان, (عمان–١٤٠٤ه), ج١, ص٢١٩؛ الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج١٦, ٣٦٠.

(٦) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٥, ص١٧٤.

(٧) ابن حجر العسقلاني, الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة, ج٦, ص٦٩.

(٨) الصفدي, الوافي بالوفيات, ج٢٩, ص١٥٦.

(٩) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص٣٠٨.

(١٠) الذهبي, معجم الشيوخ الكبير للذهبي, تحقيق: الدكتور محمد الحبيب الهيلة, مكتبة الصديق, (الطائف – ١٩٨٨ م), ج٢, ص٣٠٩؛ ابن رافع السلامي , الوفيات, تحقيق:

١٠-(**يحيى بن أحمد بن يوسف بن كامل الحسيني عماد الدين البصروي**) له سالّى (٦٢٦ك/١٢٣٨ز) له مانگى رەمەزان له دايك بووه. گوێى له زرۆ له زاناكان گرتووەو وانەى لايان خوێندوەو يەكێك لەوانەش (ابن الصلاح الشهرزورى) بووه، وەهەروەها پياوێكى سوننى چاكه كارو خاكى بووه لەسەر مەزهەبى شافعى بووه[1].زۆر خۆى له شيعەگەرى پاراستووه، هەروەها شارەزايى باشى له بوارى ميژوودا هەبووه، تەواو كەسێكى پاريزكاربووه؛ سەرپەرشتى ديوانى بێباوكانى كردووه، لەسالّى (٧٠٥ك/١٣٠٥ز) كۆچى دوايى كردووه[2].

١١/(**عبد الرحمن بن إسماعيل بن إبراهيم المقدسي الدمشقي، أبو القاسم، شهاب الدين**)[3]، وه به (ابو شامة) ناسراو بووه؛ چونكه خالّێكى گەورەى لەسەر برۆى لاى چەپى هەبووه[4]، له سالّى (٥٩٩ك/١٢٠٢ز) له دايك بووه[5]. وه هەروەها يەكێك بووه لەو قوتابيەكانى (ابن الصلاح)[6] وه هەروەها (ابو شامة) مێژوونووس و فەرموودەناس و لێكۆلەر بووه، وه له بنەچەدا خەڵكى شارى (قودس) بووه،

---

صالح مهدي عباس، د. بشار عواد معروف، مؤسسة الرسالة، (بيروت– ١٤٠٢ه)، ج٢، ص٣١٧؛ ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، ج٦، ص٦٩.

(١) ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، ج٦، ص١٨٠.

(٢) ابن الصلاح، معرفة انواع علوم الحديث، مقدمة المحقق، ص٢٣؛ ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، ج٦، ص١٨٠.

(٣) الذهبي معرفة القراء الكبار على الطبقات والأعصار، دار الكتب العلمية، (د.م–١٩٩٧م)، ج١، ص٣٤١؛ محمد بن يوسف الصالحي الشامي، سبل الهدى والرشاد، في سيرة خير العباد، تحقيق وتعليق: الشيخ عادل احمد عبد الموجود، الشيخ علي محمد معوض، دار الكتب العلمية، (بيروت– ١٩٩٣ م)، ج١٠ص٣٨١؛ علي محمد محمد الصلابي، الأيوبيون بعد صلاح الدين، دار المعرفة للطباعة والنشر، (د.م–د.س)، ج١، ص٦٠٢.

(٤) الاسنوي، طبقات الشافعية، ج٢، ص١١٨.

(٥) ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص١٣٤.

(٦) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٤٥٥؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ج١، ص٨٥٨.

هەروەها سەرپەرشتیارو مامۆستایەکی دیاری قوتابخانە(دار الحدیث)بووەو خزمەتی زۆری کردووە[١].

هەروەها (ابو شامة) خاوەن چەند پەرتووکێکی زۆر گرنگ و بەناوبانگە، کە سەرچاوەی بایەخدارن بۆ مێژوونوس و زاناکانی دوای خۆی؛ ئەویش بەناوی (کتاب الروضتین في أخبار الدولتین: الصلاحیة والنوریة)و (اختصر تاریخ دمشق)، هەروەها لە زۆربەی زانستەکان کتێبی زۆری هەیە لە بوارەکانی (فقه، فەرموودە، فەتوا...هتد)[٢]

هەروەها بەر لە تەمەنی دە ساڵی قورئانی خوێندووەو توانیەتی پلەو ئاستە زانستیەکان ببڕی و دەبێتە یەکێك لە زانا و پێشەواکان، لەگەڵ ئەوەی زانایەکی بەناوبانگ و زیرەك بوو، کەسێکی خاکی و بێ فیز بووە[٣]، (ابو شامة) دواجار لە مانگی ڕەمەزان لە ساڵی (٦٦٥ك/١٢٦٦ز) لە (دیمەشق) کۆچی دوایی کردووە[٤].

١٢/ **(ابـن رزیـن ، تقي الـدين أبـو عبـد الله محمـد بـن الحسين بـن رزيـن العـامري)**[٥]، هەروەها (قاضي القضاة شيخ الاسلام) ناسراوە[٦]، لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز) لە شاری (حماة) لە دایك بووە، وە یەکێك بووە لە پێشەواو زانا بەناوبانگەکانی ئەوکات، بەشداری لە زۆربەی زانستەکان کردووە؛ بە تایبەت زانستی (فقە)و (التفسیر)و (فەرموودە) وە هەروەها(فقە)ی لای (ابن الصلاح الشهرزوری) خوێندووە[٧].

---

(١) الزركلي, الاعلام, ج٣, ص٢٩٩.

(٢) الكتبي , فوات الوفيات, ج٢, ص٢٧٠؛ الزركلي, الاعلام, ج٣, ص٢٩٩.

(٣) ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٣٤.

(٤) النعيمی, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص١٨؛ الزركلي, الاعلام, ج٣, ص٢٩٩.

(٥) ابن حجر العسقلاني, رفع الإصر عن قضاة مصر, ج١, ص٢٠٢؛ السيوطي, تاريخ الخلفاء, تحقيق: حمدي الدمرداش, مكتبة نزار مصطفى الباز, (د.م –٢٠٠٤م), ج١, ص٣٣٨.

(٦) ابن العماد, شذرات الذهب في اخبار من ذهب, ج٧, ص٦٤٢.

(٧) السيوطي, حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة, ج١, ص٤١٧؛ اميد ابراهيم جوزەلی جوزەلی , تقی الدين ابن الصلاح الشهرزوری, ص٢٦٤.

(ابن رزين) شارەزايەکی باشی هەبووە لە زانستەکانی (الاصول، المنطق، علم الكلام)، هەموو ئەو زانست و زانیاریانە؛ پلەو پایەی ئەو زاناو پێشەوایەیان بەرزکردبویەوە[1]. دواتر دەچێتە (مصر)و لەو ولاتە دەبێتە (قاضي القضاة) لەو ناوچەیەش خزمەتی زۆر دەکات و لە زۆر شوێن وانە دەڵێتەوەو خزمەت بە قوتابیان دەکات[2]، وە دوای حەفتاو حەوت ساڵ تەمەنی پڕ لە هەوڵدان و بەخشین و بەهرەمەندی؛ دواجار لە ساڵی (٦٨٠ك/١٢٨١ز) کۆچی دوایی کردووە[3].

**١٣/ (أبو الفضل سليمان ابن الشيخ عماد الدين بن محمد ابن شرف الدين أحمد ابن الشيخ فخر الدين محمد بْن عَبد الوهاب ابن الشيرجي، الأنصاري، الدّمشقيّ)**[4]، گوێی لە (ابن الصلاح الشهرزوري) گرتووەو یەکێك بووە لە کەسایەتیە گەورەو دیارو پێشەنگەکانی ولات؛ کە خەڵك باسیان کردووە، بە کەسێکی گران و بەڕێزو چاکەکار لە گەڵ خەڵکیدا، وە کەسێکی هۆشمەند و ئارام و خاکی و بێ فیزبووە[5].

کاتێك کە تەتارەکان ئەو ناوچەیان داگیر کرد، واتە (دیمەشق) لە سەردەمی قازان ناچاریان کرد بە پابەندبوونی بە دەسەلاتەکەیان و هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی ماڵ و سامان، ئەو بە تەڵەکە و فێڵیانی زانی و کەمترین ئازاری هەبوو.(لما استولى التتار على البلد أعني دمشق أيام قازان ألزموه بوزارتهم والسعي في تحصيل الأموال فدخل في ذلك مكرها وكان قليل الأذى). وە دوای ئەوەی (ابن الشيرجى) نەخۆش دەکەوێت، لە ساڵی (٦٩٩ك/١٢٩٩ز) کۆچی دوایی کردووە، وە ژمارەیەکی زۆر خەڵك ئامادەبوون لە کاتی مردنیدا(٦).

---

(١) العماد، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ج٧، ص٦٤٢.

(٢) الذهبي، تاريخ الإسلام، ج١٤، ص٤٥٥؛ الصفدي، أعيان العصر وأعوان النصر، ج٢، ص٦٨١.

(٣) السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤١٧.

(٤) الذهبي، معجم الشيوخ الكبير، تحقيق:محمد الحبيب الهيلة، مكتبة الصديق، (الطائف – ١٩٨٨م)، ج١، ص٣١٩.

(٥) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص٩٢٥.

(٦) الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٥، ص٢٥٩.

## تەوەرەی سێیەم:- ڕۆڵی (ابن الصلاح) لە بڵاوکردنەوەی زانستدا:-

کاتێك کە باسی پێشەواو زاناو کەسایەتیەکی وەك (ابن الصلاح) دەکەین؛ دەبێت تێبینی ئەوە بکەین، کە ئەو لە ناو ژینگەیەکی ڕۆشنبیری و زانستی گەورەدا پەروەردە بووە، کە خانەوادەکەیەتی. خاوەن ناوبانگ و پلە و پایەیەکی زانستی و ڕۆشنبیری زۆر بوون؛ لە ناوچەکەدا کاریگەری دیاریان هەبووە، بەتایبەتی باوکی (ابن الصلاح)، کە زانا و کەسایەتیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی بەناوبانگی گەورەبووە، وە سەرەتای گەشەکردن و پێگەیشتن و پەروەردەبوونی (ابن الصلاح) لای باوکی بووەو ئەو زەمینەسازیەکی زۆرباشی بۆکردووە[1].

بۆ وەدەست هێنانی زانست توانیویەتی شارەزاییەکی زۆر و فراوان پەیدابکات، (ابن الصلاح) لە زۆرێك لە زانستە جیاجیاکان، واتە تەنیا لە زانستی فەرموودەدا شارەزا نەبوو، بەڵکو یەکێك بووە لە زانا هەڵکەوتووەکانی سەردەمی خۆی لە بابەتەکانی (التفسیر، فقه، زمانەوانی، فتوادان، سما الرجال ...هتد) تەواو شارەزایی هەبووە؛ بەلام ئەوەی تێبینی دەکرێ لە زانستی فەرموودەدا ناوبانگی زیاتر دەرکردووە[2].

لە لایەکی ترەوە (ابن الصلاح) لە بواری فێرکردن و وانەگوتنەوەشدا ڕۆڵی کارای هەبووە؛ توانیویەتی چەندین زاناو کەسی بە توانا پێبگەیەنێ و خزمەتی گەورەیان بکات. ئەمەش تەنها لە شوێنێکی دیاریکراو نەبووە، بەڵکو زۆر لە وڵاتان گەڕاوەو لە هەر یەك لەو شوێنانە لە قوتابخانەو ناوەندە زانستیەکان، کە ئەو کات ڕۆڵی زانکۆی ئیستایان بینیوە؛ جێی پەنجەی دیارە بووەو کاریگەری گەورەی دروست کردووە[3].

---

(١) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ کاوە فەرەج, ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسلمانەکان, ل٢٠٩.

(٢) بابەشێخی مەردۆخی, مێژووی ناودارانی کورد, ل٨٨.

(٣) امید ابراهیم جوزەلی, ابن الصلاح الشهرزوری, ص٢٣٦.

لەگەڵ ئەو هەموو بارودۆخە دژوارو ئەرکە زۆرەی، کە لەبەردەمی بوو، نەبوونە ڕێگر لە بەرەو پێش چوون و بەرهەمی زانستی ئەو، بەڵکو توانی بەو عەقڵە زانستیەی، کە دروسببوو، کۆمەڵێکی تر خەلك دروست بکات و پێبگەیەنێ، (واتە بە پەرۆشەوە خەمی بڵاوکردنەوەی ئەو زانستەی بوو کە هەیبوو)[1]، هەروەها لە ڕێگەی بەرهەمەکانیەوە؛ توانی خزمەتێکی گەورە بە خوێنەرو کتێبخانە ئیسلامیەکان بکات، دەرگایەکی گەورەی کردەوە لەسەر ئارەزوومەندانی بواری نوسین وتوێژینەوە، لە زۆر رووەوە. هەروەها کتێب و نوسینەکانی وەکو سەرچاوەیەکی ڕەسەن سوودیان لێوەردەگیرێ؛ بە تایبەتی کتێبەکانی (معرفة انواع علوم الحديث ، ادب المفتي والمستفتي، طبقات الفقهاء الشافعية) [2].

لێرەدا ئاماژە بەگرنگترین ئەو قوتابخانەو ناوەندە زانستی و ڕۆشنبیریانە دەدەین، کە (ابن الصلاح) لە ماوەی تەمەنی دا لە ناوچەو شوێنە جیایجاکان وانەی تێدا گوتۆتەوە وەکو زانا و ماموستایەك.

**یەکەم/ قوتابخانەی (الصلاحية)**:- کە بە قوتابخانەی (الناصرية)ش ناسراوە[3]،لە شاری قودس (بيت القدس)، هەروەها (ابن الصلاح) ماوەیەك لەو قوتابخانەدا وانەی داوەتەوە، وە ئەم قوتابخانەیە بەناوی ئەو کەسە کراوە، کە دروستی کردووە؛ ئەویش سوڵتان(سەلاحەددینی ئەییوبی) کوردیە[4]. وە ئەم قوتابخانە لە دوای ئازادکردنی (قودس) بڕیاری دروست کردنی دراوە لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) دوای ئەوەی سوڵتان (سەلاحەددینی ئەییوبی) لە گەڵ کۆمەڵێك زانا و کەسایەتی و سەرکردە دانیشت و بڕیاریان لەسەردا،

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢٥.

(٢) الحافظ العراقي, شرح التبصرة والتذكرة, ص٥؛ ابن حجر العسقلاني, النكت على كتاب ابن الصلاح, ص٢٥؛ كاوه فەرەج, ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسلمانەکان, ل٢٠٩.

(٣) الذهبي, تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٤٩.

(٤) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ البداية والنهاية, ج١٤, ص١٢٣.

بەڵام ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (٥٨٨ك/١١٩٢ز) تەواو بووە و هەر لە هەمان ساڵدا وانەی تێدا گوتراوەتەوە[١].وە دیارە پێشتر ئەو شوێنە کەنیسە بووە و لە پاشان وەقف کراوە، دواتر تێکدراوەو لە ئیستاشدا کەنیسەیە(٢). هەروەها لەو قوتابخانەیەدا کۆمەڵێك زانای ناودارو لێهاتوو وانەیان دەگوتەوە، کە زۆرێك لە زانستە جۆراو جۆرەکان لە قوتابخانە دەخوێندران وەکو (زانستە شەرعیەکان، فقهی تایبەت، زانستی زمانی عەرەبی، زانستی منتق، مێژوو ...هتد) وە (ابن الصلاح) یەکێك بوو لە مامۆستا هەرە دیارو بەناوبانگەکانی ئەم قوتابخانەیە[٣]، وە جێی خۆیەتی ئەوەش بخەینەڕو، کە قوتابخانەیکی تر هەبووە بە ناوی (الناصریە) لە دیمەشق[٤].

دووەم/ **قوتابخانەی (الرواحیة)**:- ئەم قوتابخانەیە لە شاری (دیمەشق) دروست کراوە[٥]، ناونراوە بە ناوی ئەو کەسەی بونیادیناوە ئەویش (زکی الدین ابی القاسم هبە الله ابن محمدبن رواحە الحموی التاجر المعدل)، کە لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز) مردووە[٦]. هەروەها (ابن الصلاح) ماوەیەك لەم قوتابخانە وانەی گوتۆتەوەو خزمەتی زۆری کردووە[٧]، هەروەها ئەم قوتابخانە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی (ابن عروە) لە ناو مزگەوتی ئومەوی[٨] . بە قوتابخانەی (شافعی)یەکان ناسراوە لە

---

(١) العليمي, الانس الجليل, ج٢, ص١٠٢.
(٢) النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص٢٥١.
(٣) العليمي, الانس الجليل, ج٢, ص١٠٣؛ احمد رضا احمد, المدارس في بلاد الشام في العصر الايوبي, رسالة ماجستير غير منشورةمقدمت الى مجلس كلية التربية, جامعة الموصل, (موصل-٢٠٠٨), ص٥٠.
(٤) اليونيني, ذيل مرآة الزمان, ج٢, ص٧٣.
(٥) الذهبي, العبر, ج٣, ص١٨٩؛ عبد القادر بدران, منادمة الأطلال ومسامرة الخيال, تحقيق:زهير الشاويش, الناشر المكتب الإسلامي, (بيروت- ١٩٨٥م) ج١, ص١٠٢.
(٦) النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص١٩٩.
(٧) الاسنوي, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٣٣.
(٨) النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص٢٦٥؛ كرد علي, خطط الشام, ج٦, ص٧٩. ص٧٩.

دەوروبەری ساڵی(٦٠٠ك/١٢٠٣ز) دروست کراوە لە ئیستادا شوێنی ئەو قوتابخانەیە ماڵە[1].

**سێ یەم/ دار الحديث الاشرفية**[2]: ڕۆڵی فەرموودە لەسەردەمی (ئەیوبی)یەکان ئەوەندە کاریگەرو بەناوبانگ و زۆربووە؛ بەڕادەیەك ئەم خانە فەرموودەییانە پێشبڕکێ قوتابخانەکانی ئەو کاتیان دەکرد[3] . لە دیارترین ئەو خانە فەرموودەییانەی، کە لایەن (ئەیوبی)یەکانەوە دروست کراون، خانەی فەرموودەی (ئەشەرفی)ییە، ئەم خانە یەکێکی تر بووە لەو ناوەندە زانستیانەی شاری (دیمەشق)، دەکەوێتە نزیك (باب القلعة الشرقي) لە رۆژئاوای قوتابخانەی (العصرونية) لە باکوری قوتابخانەی (القايمازية) [4]، کە لەلایەن (ملك الاشرف مظفرالدين موسى بن الملك العادل بن ايوب) دروست کراوەو بەناوی ئەویشەوە کراوە، کە لە ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ز) مردووە، وە خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێکردووە بەمەبەستی فێربوونی زانستی فەرموودە[5]، کە بە (دار الحديث الاشرفية) ناسراوبووە[6]، هەروەها

---

(١) كرد علي, خطط الشام, ج٦, ص٧٩.

(٢) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.

(٣) ناصر محمد علي الحازمي, الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي, رسالة ماجستير غير المنشورة مقدمت الى مجلس كلية الشريعة والدراسات الاسلامية, جامعة ام القرى, مكة المكرمة, ج١, ص٢٨٠.

(٤) النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص١٥.

(٥) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٤؛ ابن تغري بردى, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٢٨٠؛ السيوطي, تاريخ الخلفاء, ص٣٢٦.

(٦) اليونيني, ذيل مرآة الزمان, ج٣, ص٢٨٨؛ ابن تغري بردى, النجوم الزاهرة, ج٦, ص٢٨٠؛ النعيمي, الدارس في تاريخ مدارس, ج١, ص١٥؛ الحنفي, مفاكهة الخلان في حوادث الزمان, دار الكتب العلمية, (بيروت:١٩٩٨), ص١٣٣.

ماوەیەك (ابن الصلاح ) سەرپەرشتی كردووەو ماوەی سێزدە ساڵ ماوەتەوە لەو شوێنە، تاوەكو ئێستا ئەو شوێنە هەر قوتابخانەیە[1].

**چوارەم/ قوتابخانەی (ست الشام زمرد خاتون)[2]** ؛ وە (الشامیة الجوانیة)ی پێ گوتراوە[3]، دیارە لە سەردەمی (ئەییوبی)یەكان ئافرەتان خاوەن ڕۆڵ وپێگەی گەورەو بەرفراوان بوونە؛ لە بواری جولەی زانستی و ڕۆشنبیری لە ولاَتی (شام)، شان بەشانی پیاوان دەستی بالاَیان هەبووە لە گەشەپێدان، بە فێربوون و دامەزراوە زانستیەكانی ولاَتانی ئیسلامی. لەو ماوەیەدا ولاَتی (شام) ببووە ناوەندێكی چالاَكی زانستی ئافرەتان، كە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ مامۆستایان و قوتابیانی ئافرەت هاتنە نێو مەیدانی كار؛ تەنانەت بوونە سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری چەندین قوتابخانەو ناوەندی زانستی، كە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەركەوتنی ڕۆڵی بەرچاوی ئافرەت لە نێو دەوڵەتی (ئەییوبی)، باشترین نموونەش بۆ سەلماندنی ئەو ڕۆڵە (زمردخاتون)ە، كە پێگەیەكی گەورەی هەبوو لە بواری زانستی و ڕۆشنبیری لەو كاتدا[4].

هەروەها بە (الشامیة الصغری)یش ناسراوە[5]، كەوتۆتە بەرامبەر بیمارستانی (النوری )یە، لە شاری (دیمەشق)[6]، ناوەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ دورستكەرەكەی، كە ئەویش (ست الشام زمردخاتون) كچی (نجم الدین ئەیوبی كوری شادی كوری

---

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٢٤؛ شەرەف خانی بدلیسی, شەرەفنامە, و:مامۆستا هەژار, چ٦, (سنه –٢٠١٣), ل١١٩.

(٢) الذهبي, سير اعلام النبلاء, ج٢٣, ص١٤١.

(٣) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٦٨.

(٤) احمد رضا احمد, المدارس في بلاد الشام في العصر الايوبي, ص٨٣.

(٥) الذهبي, تذكرة الحفاظ, , ج٤, ص١٤٩؛ النعيمي, الدارس في تاريخ الدارس, ج١, ص٢٢٩.

(٦) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٤؛ ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص ص١٠٠_١٠١؛ النعيمي, الدارس في تاريخ المدارس, ج١, ص٢٢٧.

مەروان)، کە ساڵی (٦١٦ك/١٢١٩ز) کۆچی دوایی کردووە[١] . ئەم قوتابخانەیە تایبەت بووە بە مەزهەبی (شافعی) و زانا شافعیەکان لەم قوتابخانەیە خزمەتی زۆریان کردووە[٢].

هەروەها لەم قوتابخانەیە چەندین زانای بەناوبانگی ئەوکات وانەیان تێدا گوتۆتەوە، یەکێك لەو ماموستاو زانایانەش (ابن الصلاح الشهرزوری) بووە؛ کە ڕۆڵی گەورەی گێڕاوە لەو قوتابخانەیە[٣] . دیارە ئەم قوتابخانەیە لە ئیستادا شوێنەواریکی ئەوتۆی نەماوە و شوینەکە بۆتە ماڵ[٤].

(ابن الصلاح) لە زۆر شوێن و ناوەندی تری زانستی و ڕۆشنبیری خزمەتی گەورەی کردووە شان بەشانی زانایان و ماموستاکانی تری ئەوکات، کە خاوەن پلەو پایەی زانستی گرنگ بووینە. وە بە درێژایی سەردەمی (ئەیوبی) ئەم قوتابخانەیە بووە ناوەندو ڕووگەیەك بۆ زانست و زانایان؛ بەردەوام بوو تا سەردەمی (مەملوکی)یەکان، چەندین زانای گەورەی لە بواری (فقە) و فەرموودەناسی و تەفسیر، لەم قوتابخانەیە دەرچوون و پێگەیشتن، هەموو ئەو کەسانە، کە لەو قوتابخانەش نیشتەجێ بوون؛ خەلکێکی چاکەخوازبوون، دووربوونە لە هەر کارێك، کە لەگەل بنەماو بنچینەکانی ئیسلام نەگونجاوبووە، لەوانەش هەر زیادە و کارێك، کە لە بنەرەتدا بوونیان نەبووە لە ناو ڕێبازی ئیسلام، هەروەها هاوکاری باشی ماموستا و قوتابیان کراوە لە دابینکردنی پیداویستیەکان [٥].

---

(١) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٣.

(٢) النعيمي, الدارس, ج١, ص٢٠٩.

(٣) بدران, منادمة الأطلال ومسامرة الخيال, تحقيق: زهير الشاويش, المكتب الإسلامي , (بيروت١٩٨٥م) ج١, ص١٠٨.

(٤) كرْد عَلي, خطط الشام, ج٦, ص ٨٠ ؛ كارل بروكلمان, تاريخ الادب العربي, ت:عبد الحليم النجار, ط٥, دار المعارف, (القاهرة:د.س), ج٦, ص٢٠٢.

(٥) النعيمي, الدارس, ج١, ص١٠٧؛ بدران, منادمة الأطلال ومسامرة الخيال, ص ص١٠٨- ص١٠٨-١٠٩.

هەروەها (زمردخاتون) قوتابخانەیەکی تریشی دروست کردبوو بە ناوی (الشامیة البرانیة)، کە بە قوتابخانەی (الحسامیة)ش ناسراو بووە[1]، ئەگەر سەرنج بدەین (ابن (ابن الصلاح) لە هەریەك لەو قوتابخانانەی، کە وەکو مامۆستا وانەی تیایدا گوتۆتەوە، خاوەن کاریگەریەکی گەورە بووە توانیویەتی جێ پەنجەی دیاربێت و ڕۆڵ و پێگەی بەرز بووە چ لە لای قوتابیەکان و چ لە لای مامۆستاکانیشەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی، کە (ابن الصلاح) خاوەن توانا و لێهاتنێکی گەورە بووە لە زانستە شەرعیەکان.

(١) ابن کثیر, البدایة والنهایة, ج١٣, ص ص١٠٠_١٠١؛ النعیمي, الدارس في تاریخ المدارس, ج١, ص٢٢٧؛ ناصر محمد علي الحازمي, الحیاة العلمیة في دمشق في العصر الایوبي, ج١, ص٢٨٠.

# بەشی سێیەم :

# پێگـەی زانستـی ( ابن الصـلاح ).

تەوەرەی یەکەم: ڕێبازی نووسینی ( ابن الصلاح ).

تەوەرەی دووەم: ئەو سەرچاوانەی ( ابن الصلاح ) پشتی پێ بەستوون لە نووسینەکانی.

تەوەرەی سێیەم: ووتەی زانایان لەبارەی ( ابن الصلاح ).

تەوەرەی چوارەم: بەرهەمەکانـــــی ( ابن الصلاح ).

## بەشی سێ یەم:- پێگەی زانستی ( ابن الصلاح الشهرزوري ):-

### تەوەرەی یەکەم: ڕێبازی نووسینی( منهجه ):-

ئەگەر سەرنج بدەین لەگەڵ ئەوەی زانایان و میژوونووسانی کۆن، لە کاتی نووسینی کتێب و نوسراوەکانیاندا، تێبنی ئەوە دەکرێ، کە شێوازی نووسینیان زۆر ڕوون نییە، کەمێکیان نەبێت؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر بەدواداچوون و لێوردبوونەوە بکەین؛ دەتوانین بە جۆرێك لە جۆرەکان، شێوازو تایبەتمەندی نووسینەکانیانمان بۆ دەرکەوێ. وە دیارە (ابن الصلاح) یش لەم یاسا و ڕووخسارە گشتیانە بەدەرنەبووە[1]، لێرەدا هەوڵ دەدەین گرنگترین ئەو سیماو تایبەتمەندیانەی (ابن الصلاح) لە نووسینەکانی دا بخەینەڕوو:-

**یەکەم:-** یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی بریتی بووە، لە کۆکردنەوەی زۆریك لە زانستە جۆراوجۆرەکان و لێك نزیکردنەوەو پەیوەستی کردوون بەیەکەوە، لەوانەش لە بواری بابەتە فقهی و بواری زانستی فەرموودە، کە ئەمەش بە ڕوونی و زەقی دەردەکەوێ لە نووسن ونوسراوەکانی (ابن الصلاح)، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێگەیشتنە قووڵ و فراوانەی، کە ئەو زانا پایە بەرزە هەیبووە لە زانستەجۆراوجۆرەکان؛ بە تایبەتی لە زانستی (فەرموودە، فقە، الاصول، التفسیر)و هەڵهێنجانی ووردی کردووە [2].

**دووەم:-** بەهیچ شێوەیەك (ابن الصلاح) زاراوەو بواری زمانەوانی هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی فەرامۆش نەکردووە؛ بەهۆی ئەو شارەزایی و ڕووچوونە زۆرەی، کە هەیبوو بۆ زانستی زمانەوانی، وە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی هەبووە لەسەر زۆر زاراوە و بەتەواوی بنچینەی وشەکەو جۆری خوێندنەوەکەی دەرخستووە [3].

---

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٣٣.

(٢) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٢؛ کاوە فەرەج, ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسلمانەکان. ل٢٠٩.

(٣) ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٣؛ السخاوي, فتح المغيث, ج١, ص ص٢٣-٢٤؛ شەرەف خانی بدلیسی, شەرەفنامە, ل١١٩.

**سێیەم:-** یەکێك لە سیما دیارەکانی شێوازی نووسینی(ابن الصلاح) بریتی بووە لە:- کورت بڕی و پوختی لە نوسین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە بیرنەکردووە، کە لە هەندێ شوین پێویستی بە نموونە هێنانەوە هەبووە؛ هێناویەتەوە وەکو فەرموودە، وتە یاخود شیعر؛ ئەمەش بەمەبەستی بەهێزکردنی بابەتەکەو ڕۆشنکردنەوەی زیاترو بێزارنەبوونی خوێنەر[1].

**چوارەم:-** هەر کاتێك لەسەر بۆچوونێك ڕاوەستابێت و شانازی پێوەکردبیت، کە ڕای جیاوازی لەسەر بوبێت، هەوڵی داوە ئەو بۆچوونەی پتەوبکات؛ بە پاڵپشتی ڕای زانایانی ترو وتەی زانایانی لەو بارەوە هێناوەتەوە، ئەمەش بە ڕوونی لە نوسراوەکانی ئەودا دیارە؛ هەر بۆیە نوسین و بۆچوونەکانی لە لای زانایانەوە زۆر بەگرنگ و بایەخەوە سەیر کراوە[2] .

**پێنجەم:-** ئەگەر سەیری لاپەڕەی پەرتووکەکانی (ابن الصلاح) بکەین، دەبینین، کە (ابن الصلاح) خاوەن کەسایەتیەکی بەرزو کەم وێنە بووە؛ ئەمەش بەهۆی ئەو ڕاو بۆچوونە نوێ و کاریگەرانەی، کە بەدی کراوە لە نوسراوەکانی دا، هەروەها ئەو توانا زۆرەی، کە هەیبووە لە گفتوگۆ و پەسەندی و ناپەسەندی ڕاو بۆچونەکان[3].

**شەشەم:-** هێنانی پێناسەی جۆراو جۆری زۆر بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی تەواو بۆ بابەتەکان، گرنگی زۆری بەو لایەنە داوە، وە ئەوەی کاریگەری لەسەر بووە ئەو هەستە (اصول)یەی، کە هەیبووە، وە هەر پاڵنەرو هۆکاریکی تر هەبێت، هەرچۆنێك بێت ئەمە بە ڕوونی ڕەنگیداوەتەوە لە نوسینەکانی؛ بەتایبەتی لە بواری فەرموودەناسیدا. هەر بۆیە هەمیشە سووربووە لەسەر دەرخستی ناوەڕۆکی بابەتەکان، وە زۆرجار بۆ بابەتێك یان کەسیك، زیاتر لە پێناسەیەکی هێناوەو کۆیکردونەتەوەو هیچی فەرامۆش نەکردووە[4].

---

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٤١.

(٢) بابەشێخی مەردوخ, مێژووی ناودارانی کورد, ل٨٨.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٤١.

(٤) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٣٣.

**حەوتـــەم:-** نوێکـاری یـەکێك بـووە لـە تایبەتمەندیـەکانی شـیوازی، نوسـینی (ابـن الصلاح)، هەندێ بابەت و بەشی باسکردووە، کە لـە پێشتر باسنەکراوە، ئەمـەش لـە پێنـاو ئاسـانکاری بـۆ لێکۆڵـەرو پشـت بەسـتنی خوێنـەر بـۆ تێگەیشـتنکێکی بـاش؛ بەتایبەتی ئەو دابەشکردنانەی، کە لە بواری فەرمووده کردویەتی[1].

**هەشتەم:-** (ابن الصلاح) خاوەن عەقڵیـەتێکی کـراوەو تێروانینێکـی دروسـت بـوو[2]، توانای شیکردنەوەو جیاکردنەوەی بابەت و بۆچوونە هەڵەکانی پێش خۆی هـەبووە، شوێنی هەڵەکەی دەستنیشانکردووە، ئەوانـەی لـە چوارچێوە تێگەیشتن و شـارەزایی ئـەو بووینـە. وە هەنـدێ جـار، کـە ڕەخنـەی گرتـووەو هەسـتی بـە شـتێك کـردووە؛ ویستویەتی ڕوونکردنەوەش بدات لەسەر مەبەستی وتەکانی، کـە ئەمـەش زۆر دیـارە لە چوارچێوەی شێوازی نووسینەکانی.

هـەروەها تـەواو قـووڵ دەبویـەوە لـە وتـەو هەڵبـژاردەکانی زانایـان؛ بـۆ نموونـە لەسەر قسەی هەندێ لەو کەسانەی، کە پلەو پایەی (صحيح مسلم)یان دەدا بەسـەر (البخـاری)، لـە گێڕانـەوەی فـەرموودەدا، وە لـەو بـوارەدا (ابـن الصـلاح)، گەیشـتبووە لوتکە؛ لە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی وتەکانی زانایانی پێش خۆی[3].

**نۆیەم:-** دەرخستن و پیشاندانی پلەوپایەو ریزبەنـدی کردنـی دانراوەکـانی، ئەمـەش لە پێناو پێدانی هۆشیاری بە قوتابیان، بۆ چۆنیەتی پشت بەستن بەو سەرچاوانە لە کاتی بەکارهێنان و سوود وەرگرتنیان[4].

**دەیەم:-** یـەکێکی تـر لـە سیما دیارەکانی شێوازی (ابـن الصـلاح) بریتـی بـووە لـە:- دانانی بنەماو بناغەیەکی یاسایی، کە لە چوارچێوەی ئـەو بنـەماو یاسـایانە بریـاری

(١) الزركشي, النكت على مقدمة ابن الصلاح, ج١, ص ص٩-١٠.
(٢) ابن كثير, البداية والنهاية, ج١٣, ص١٦٩.
(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٣٥
(٤) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٣٩.

لەسەر زانستەکان داوە، ئەمەش بەهۆی فراوانی زانیاری و زانستی؛ بە تایبەتی لە بواری ئاینی، وە ئەزموونی باشی هەبووە لە ڕێساو بنچینە ئوسولیەکان [1].

**یازدەیەم:-** (ابن الصلاح) لە پێناو تەواوکاری لێکۆڵینەوە زانستیەکانی و سوودوەرگرتن لە هەوڵ و ماندووبوونەکانی پێش خۆی، هەرگیز بۆچوون و ڕای زاناکانی پێش خۆی بە ڕەهایی و یەکجارەکی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو بۆچوونەکانی وەرگرتوەو پاشان زیادەی خستۆتەسەر، یاخو تەواوی کردوەو ڕوونکردنەوەی لەسەر داوە[2].

**دوازدەیەم:-** کاتێك کە (ابن الصلاح) ڕەخنەی لەسەر بابەت وپرسێك هەبوبێت؛ بەڵگەی تەواوی هێناوەتەوە، کەمتەرخەمی نەکردووە لە لەوبارەوە، جا ئەو بابەتانە ڕاو بۆچوونی جیاوازی لەسەر بێت یاخود زانایان لەسەری کۆك بووبن، وە دەریدەخست بژاردەو ڕاو بۆچونی نوێی لە کاتێك بۆ کاتێکی تر[3].

**سێزدەیەم:-** هەر کەسێك ئەگەر پەرتووکەکانی (ابن الصلاح) بخوێنێتەوە؛ دان بەوە دەنێت، کە خاوەن ئەدەب و ڕێزێکی یەکجار گەورە بووە، کە بەمەش دانراوەکانی پێڕازاندۆتەوە، ئەمە گوزارشت بووە لە پارێزکاری و دونیانەویست و خاکی بوونی ئەو زانایەیە؛ هەمیشە دانی بەگەورەیی و پایەبەرزی زانایانی پێش خۆی داناوە.

بەواتایەکی تر ئەو هەوڵ و ماندووبوونی·ئەوانی بەرزنرخاندووە؛ هەرگیز لە ئاستیاندا خۆ بەگەورەزانی و فیزی نەبووە، پیاوێکی لە خواترس و خاکی و زانست دۆست بووە[4].

**چواردەم:-** دەرخستنی لایەنی کردەیی لای (ابن الصلاح)، ئەمەش بە ڕوونی دەدردەکەوێ لە ئەنجامی خستنەڕووی ئەو هەموو نموونەیە لە بەرهەمەکانی[1].

---

(١) السخاوي, فتح المغيث, ص١٣.

(٢) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, ص٢٧

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق؛ ص٣٨

(٤) اليافعي, مرآة الجنان ج٤, ص٨٥؛ ابن كثير, ج١٣, ص١٤٢؛ الاسنوي, طبقات الشافعية, ج٢, ص١٣٣؛ ابن قاضي شهبة, طبقات الشافعية, ج٢, ص١١٣.

بەم شێوە دەتوانینین بڵێین، کە (ابن الصلاح) خاوەن شێوازێکی تایبەت و کاریگەر بووە، هەر ئەمەش وای کردووە ئەم شێوازە نووسینەی دواتر ببێتە بەرچاو ڕوونی و ڕێچکەی زۆرێك لە زانایان و فەرمووودەناسانی دوای خۆی.

## تەوەرەی دووەم:- ئەو سەرچاوانەی (ابن الصلاح) کە لەنوسینەکانیدا پشتی پێ بەستوون:-

کاتێك سەرنجی پەرتووك و دانراوەکانی (ابن الصلاح) دەدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە پشتی بە زۆر سەرچاوەی جۆراو جۆر بەستووە؛ بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی زانیاریەکان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆشبیریە فراوان و جۆراو جۆرەی (ابن الصلاح)، کە هەیبووە لەو مەیدانەدا [2]. ئەمەش کاریگەری زۆری هەبووە، کە بەرهەمەکانی شوێنەوارێکی زانستی باش جێبهێلێت و ڕۆڵی خۆی بگێڕێ لە دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری ئیسلامی[3].

هەر بەهۆی ئەو زانست و زانیاریە گرنگ و زۆرانەی، کە بەدی دەکرا لە دانراوەکانی؛ بەتایبەتی لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی لە بواری فەرمووودەناسیدا (معرفة انواع علوم الحديث)، کە چەندین زانای ناودارو بەناوبانگ سوودیان وەرگرتووە و کتێبی تریان لەسەر نوسیووە، هەروەها کتێبەکانی (ابن الصلاح) بۆتە بنەماو بناغەی دارشتنی کتیبەکانیان لەوانەش (امام النووی)[4]، کە دوو کتێبی

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٤٢.

(٢) ابن الصلاح, معرفة انواع علم الحديث, مقدمة المحقق، ص٤٣.

(٣) اميد ابراهيم جوزەلی , تقی الدين ابن الصلاح الشهرزوری, ص٢٥٩.

(٤) النووي: (ابو زكريا يحيى بن شرف النووي), لە سالی (٦٣١ك) لە دايك بووە, زانايەكی بەناوبانگ و ناسراوە لێهاتوو بووە خاوەنی چەندين کتێبی گرنگ و بەسوودە و لەوانەش کتيبی (شرح صحيح مسلم) و (رياض الصالحين) وچەندانی تر, وە لەسالی (٦٧٦ك) کۆچی دوايی کردووە. المقريزی, إمتاع الأسماع, ج١٥, ص٣٥٢؛ عبدالله بن فودی, : منظومة مصباح الراوي في علم الحديث, تحقيق وشرح:محمد المنصور إبراهيم, ط٢, دار

لەسەر کتیبەکەی ابن الصلاح) نووسیوە، یەکێکیان بەناوی (الارشاد)ە ئەویتریان بەناوی (التقریب والتیسیر لمعرفة سنن البشیر النذیر) .

هەروەها (ابن کثیر)[1] یش بەهەمان شێوە کتێبێکی لەسەر داناوە، بەناوی (اختصار علوم الحدیث)، ئەمەو چەندان زانای تری بەناوبانگ، کتێبی جۆراوجۆریان لەسەر داناوە[2]. (ابن الصلاح) لە نووسینەکانیدا؛ پشتی بە دوو جۆر سەرچاوە بەستبوو ئەوانیش بریتی بوون لە:-

**یەکەم:-** سەرچاوەی زارەکی:-

**دووەم:-** سەرچاوە کانی پیش خۆی:-

## یەکەم:- سەرچاوەی زارەکی:-

هەروەکو ئامازەمان پێدا، کە (ابن الصلاح) بەهۆی ئەو گەشتە زانستی و گەڕانە بەرفراوانەی، کە ئەنجامی داوە؛ بۆ شوێن و ناوچە جۆراو جۆرەکان، بەمەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری؛ لای زانایانی سەردەمی خۆی، لەم ڕێگەیەشەوە توانیویەتی زانیاری جیاواز کۆبکاتەوەو ئاستی ڕۆشنبیری خۆی دەوڵەمەند بکات، ئەزمونێکی زۆر کۆبکاتەوە، سەبارەت بە دانان و نووسینی پەرتووك، ئەم

---

العلم للطباعة والنشر، (د.م- ٢٠٠٥م)، ج١، ص٢٧؛ صبحي ابراهيم صالح، علوم الحديث ومصطلحه، دار العلم للملايين، (بيروت -١٩٨٤)، ص٧٤.

(١) ابن کثیر: ناوی تەواوی (ابو الفداء اسماعيل بن عمر بن بن كثير) لەساڵی (٧٠٠ك/١٣٠٠ز) لە دایك بووە، وە یەکێك بووە لە زاناو مێژوونووسە هەرە دیارەکانی و شارەزایی زۆری هەبووە لە چەند بوارێك و چەندین دانراو و کتێبی بەسوودی داناوە لەوانەش (تفسيرالقران العظيم)، البداية والنهاية..) وە ئەم زانایە لە ساڵی (٧٧٤ك/١٣٧٢ز) کۆچی دوایی کردووە. شمس الحسيني الدمشقي الشافعي، . ذيل تذكرة الحفاظ، دار الكتب العلمية، (د.م- ١٩٩٨م) ج١، ص٣٨) ؛ الزركلي، الاعلام، ج١، ص٣٢٠.

(٢) الحافظ العراقي، شرح التبصرة والتذكرة، ص٨.

زانیاریانەشی بە دوو شێواز وەرگرتووە، یان بەشێوەی ڕاستەوخۆ لە ماموستاکانی یاخود لە چەند کەسێکی تری وەرگرتووە [1].

## دووەم:- سەرچاوەکانی پێش خۆی:-

لە پاڵ سەرچاوە زارەکیەکان، (ابن الصلاح) پشتی بە کۆمەڵێك سەرچاوەی نوسراوی گرنگ بەستووە؛ لە زۆر بابەتی جۆراوجۆردا، وەك (فەرموودە، تەفسیر، مێژوو، ئەدەب و زمانەوانی...هتد). لەم ڕووەوە؛ بە تایبەتی پشتی بە دوو زانا بەستووە، ئەوانیش:- (ابو عبدالله نیسابوری)[2]، کە (ابن الصلاح) زۆر لە بۆ چونەکانی وەرگرتووەو سوودی لێوەرگرتووە؛ بە تایبەتی لە کتێبەکەی (معرفة انواع علوم الحدیث)[3]، (خطیب البغدادي)[4]، کە ئەوەشیان لە بواری فەرموودەدا شارەزاەکی یەکجار گەورەی هەبووە، (ابن الصلاح) زۆر سوودی وەرگرتووە لە بەرهەمەکانی؛ بە تایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی (الکفایة فی معرفة الروایة).

---

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق, ص٤٣.

(٢) ابو عبدالله النيسابوری, محمدبن عبدالله بن محمد بن حمدويه بن نعيم بن الحكم النيسابوری, بە (ابن البيع) ناسراوە, خاوەن چەندین بەرهەمە لە زانستی فەرموودە, سەردانی زۆرناوچەی کردووە, گوێ زیاتر لە هەزار زانا گرتووە, هەروەها شارەزای لەبواری زانستی قورئان وشەرعناسیوئەدەب دا هەبووە, لەسالی(٤٠٥ك/١٠١٤ز) کۆچی دوای کردووە. الذهبي, تاريخ الاسلام, ج٩, ص٨٩.

(٣) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, ص٤٤.

(٤) خطيب البغدادي, (الإمام الحافظ أبي بكر احمد بن علي بن ثابت الخطيب البغدادي), خاوەن(٥٦) بەرهەمە لەگرنگترینیان کتێبی(تاريخ بغداد) ە, کەکتێبێکی نایابە کەچەندین زانای فەرموودەناسی ومێژووی بەغدای لەم کتێبە تۆمارکردووە, بەهۆی ئەم کتێبەوە ناوبانگی ناسراوە, هەروەها لەبواری (علم الرواية) خاوەن کتێبی (الكفاية في معرفة الرواية) یەکەبۆتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زانایانی فەرموودەناسی دوای خۆی, لەسالی(٤٦٣ك/١٠٧٠ز) کۆچی دوای کردووە. خطيب البغدادي, تاريخ بغداد, ج١, ص١؛ الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١٠, ص١٧٥؛ ابن حجر العسلاني, الاصابة في التميز الصحابة, تحيق:عادل احمد, دار الكتب العلمية, (بيروت:١٤١٥), ج١, ص٢٢؛ الزركلي, الاعلام, ج١, ص١٧٢.

## تەوەرەی سێیەم:- ووتەی زانایان لەبارەی (ابن الصلاح):-

(ابـن الصـلاح) یـەکێك بـووە لـەو زانـاو پێشـەنگانەی، کـە بـەهۆی زۆری بەرهەمـەکانی و فراوانـی ڕۆشـبیری یەکـەی و بـەرزی پێگەکـەی؛ ناوبـانگێکی زۆر گـەورەی دەرکـرد، کـە سـنوری وولاتێـك و ناوچـەیەکی دیـاریکراوی تێپەڕانـدووە ، بەمـەش زۆرێـك لـە زانایـانی سـەردەمی خـۆی و هـەروەها زانایـانی دوای خۆشـی لـە ڕێگەی لێکۆلینەوە لە بەرهەمەکانیەوە، وتە و نوسینی گرنگ و جوانیـان نووسـیوە لە بارەی کەسایەتی و بەرهەمەکانی (ابن الصلاح)، لە مەیدانی زانستی و ڕۆشنبیریدا [1].

بەشێوەیەك باسیان لە(ابن الصلاح) کردووە، کە ئـەو زانایـە لـە زۆربـەی بـوارە جۆراوجۆرەکاندا شارەزایی هەبووە؛ کاریگەری و شوینەواری زۆری بـەجێ هێشـتووە. لێرەدا ئاماژە بە گرنگترین ئەو وتە و نووسینانە دەکەین، کە زانایـان لـەو بارەیـەوە نووسیویانە.

## یەکەم:- ابن خلکان:-

یەکێك بوو لـە قوتابیـەکانی (ابـن الصـلاح) بـە بەشـیوەیەکی زۆر جـوان باسـی کردووەو پێگە زانستیەکەی دەرخستووە، هەروەکو دەڵێت:- ((کان أحد فضلاء عصـره في التفسـير والحـديث والفقـه وأسمـاء الرجـال، ومـا يتعلـق بعلـم الحـديث ونقـل اللغـة، وكانت له مشاركة في فنون عديـدة، وكانت فتاويه مسددة)) [2]. واتـە یـەکێك بـووە لـە زانا ناودارەکانی سـەردەمی خـۆی، لـە تەفسـیرو فـەرموودە و شـەرع و نـاوی پیـاوان و ئەوەشی، کـە پەیوەنـدی بـە زانسـتی فـەرموودە هـەبێت، وە بەشـداری لـە زۆر بـواری هونەریدا هەبووە، فتواکانیشی پێکراو بوونە.

(١) ئەحمـەد مـەحموود ئەلخـەلیل, مێـژووی کـورد لـە شارسـتانیەتی ئیسـلامیدا, ل ل٢٧٣-٢٧٤.

(٢) وفيات الاعيان ج٣, ص٢٤٣.

## دووەم:- السبكي[1]:-

لە باسی (ابن الصلاح)دا بەمشێوە نووسیویەتی:- ((الشيخ العلامة تقي الدين احد أئمة المسلمين علما ودينا... وتفقه عليه خلائق، وكان إماما كبيراً فقيهاً محدثاً زاهداً ورعا، مفيداً معلماً استوطن دمشق يعيد زمان السالفين ورعا، ويزيد بهجتها بروضة علم جنى كل طالب جناها ورعا، ويفيد أهلها فما منهم إلا من اغترف من بحره واعترف بذرّه وحفظ جانب مثله ورعا))[2]، واتە:- (یەکێك بووە لە پێشەواکانی موسڵمانان لە ڕووی زانست و ئاینەوە، پیشەوایەکی گەورەو شەرعزان و فەرموودەناس و خواناس و پاریزکارو سوودبەخش و ماموستا بووە، لە (دیمەشق) نیشتەجێ بووەو لەسەر ڕێچکەی پیشینەخواناسەکان بەردەوام بووە، هەموو ئەو قوتابیانەی، کە هەیبوو ڕەنگدانەوەی ئەویان لەسەر بوو لەو ڕووەوە، وە دەوروبەرەکەی سوودیان وەرگرتووەو داننیان ناوە بەو بە زانست و زانیاریەی، کە هەیبووە).

## سێیەم:- الذهبي[3]:-

ئەم زانایە تەواو ڕۆچووە لە پێداهەلگوتنی (ابن الصلاح) لەبارەیەوە دەڵێت:- ((الإمام الحافظ العلامة شيخ الإسلام... كان ذا جلالة عجيبة ووقار وهيبة، وفصاحة، وعلم نافع، وكان متين الديانة، سلفي الجملة، صحيح النحلة، كافاً عن الخوض في مزلات الأقدام، مؤمناً بالله وبما جاء عن الله من أسمائه ونعوته، حسن البزة، وافر الحرمة، معظماً عند السلطان... وكان مع تبحره فيالفقه مجوّداً لما ينقله، قوي المادة

---

(1) (السبكي):ناوی تەواوی (عبدالوهاب بن علی بن عبدالكافی السبكی) یە, ڕەچەڵەكی دەگەڕێتەوە بۆ (سبك) كە ناوچەیەك سەر بە (منوفیە) لە میسرلە ماوەی (٧٢٧ك-٧٧١ ك) ژیاوە لە گرنگترین بەرهەمەكانی بریتیە لە (طبقات الشافعية الكبرى), الزركلي, الاعلام, ج٤, ص١٨٤.

(2) طبقات الشافعية, ج٨, ص ص٣٢٦-٣٢٧.

(3) (الذهبي) ناوی (شمس الدين بن عبدالله محمد بن احمد بن عثمان بن قايماز الذهبي) لە ماوەی (٦٧٣-٧٤٨ك) (١٢٧٣_١٣٤٧ز) ژیاوە و خاوەنی چەندین كتێبی بەناوبانگە وەكو (سير اعلام النبلاء, طبقات الحفاظ), الذهبي, تاريخ الاسلام, ج١, ص١.

من اللغة والعربية، متفتنـا في الحديث، متصوناً مكِباً على العلم، عديم النظير في زمانه))[1]. واته (خاوهنى گهورهييهكى سهرسورهێنهرو شكومهندى و رهوانبێژى و زانستێكى بهسوودو ئايندارێكى بههيزو لهش و لارێكى بههێز بوو، خاوهن رێزى زۆر بووه لاى دهستهلأتدارهكان، شارهزاييهكى زۆرى ههبووه له رووى زمانهوانى و فهرموودهناسى و ههميشه بهدواى زانست و زانياريهوه بووه).

## چوارهم:- ابى عمرو بن الحاجب[2]:-

ئهمهش وهسفێكى ورد و جوانى (ابن الصلاح) دهكات و دهڵێت:- ((إمام ورع، وافر العقل، حسن السمت متبحر في الأصول والفروع، بالغ في الطلب حتى صار يضرب به المثل، وأجهد نفسه في الطاعة والعبادة))[3]. واته (پيشهوايهكى پاريزكار، بير فراوان، بهشێوهيهكى باش باسى كراوه؛ خاوهن زانست و زانياريهكى فراوان بووه، خۆى زۆر به پهرستشى خوا خهريك كردووه).

## پێنجهم:- صفى الدين المراغى[4]:-

لهبارهى (ابن الصلاح) دهڵێت:- ((أحد الأئمة المشهورين، والعلماء العاملين، والحفاظ المذكورين، جمع بين علوم متعددة: علم الفقه وعلم أصوله وعلم الحديث وعلم العربية، مع ما أوتي من التحري والإتقان، مضافاً إلى سلوك طريقة السلف،

---

(١) تذكرة الحفاظ, ج٤, ص١٤٩.

(٢) (ابى عمرو بن الحاجب): ناوى (ابي عمرو عثمان بن عمر بن ابى بكر) نازناوى (جمال الدين) ى ههبووه و شارهزايى زۆرى ههبووه له زانستى (اصول و فقه) له ساڵى (٦٧٢ك/١٢٧٣ز) مردووه, ابن خلكان, وفيات الاعيان, ج٣, ص٢٤٩؛ حاجى خليفة, كشف الظنون, ج١, ص١٦٢.

(٣) الذهبي, سير اعلام النبلاءج٢٣, ص١٤٢؛ ابو سهل محمد بن عبدالرحمن ن موسوعة موافق السلف فى العقيدة والمنهج والتربية, (قاهيرة, د.س) ج٧, ص٣٢٧.

(٤) (صفى الدين) ناوى تهواوى (خليل بن ابي بكر بن محمد بن صديق ابو الصفاء صفي الدين المراغي) زانايهكى بهناوبانگ و شارهزا بووه له قاهيره مردووه, اليونيني, ذيل مراة الزمان, ج٤, ص٢٨٣.

معظما عند الخاص والعام))[1]. واتە:- ( یەكێك بووە لە پێشەواو زانا هەرە دیارو كاراكان، توانایەكی باشی هەبووە لە تێگەیشتن و خەڵك باسیان كردووە بە لێهاتوویی، كۆكەرەوەی زۆرێك لە زانستە جۆراو جۆرەكان بووە)

شارەزایی لە (زانستی اصول و زانستی فەرموودەناسی) هەبووە خاوەن لێزانی و وردەكاری زۆر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا تەواو پابەند بووە بە رەفتارو كردەوەی پێشینەكانی و پێگەیەكی گەورەی هەبووە لە ناو خەڵكدا.

## شەشەم:- ابن كثير:-

لە وەسفی (ابن الصلاح)دا دەڵێت:- (( وكان ديناً زاهداً ورعاً ناسكا، على طريقة السلف الصالح، كما هو طريقة متأخري أكثر المحدثين مع الفضيلة التامة في فنون كثيرة، ولم يزل على طريقة جيدة حتى كانت وفاته))[2]. واتە:- (یەكێك بوو لە زانا گەورەكان، ئاین پەروەرو خواناس و پارێزەرو پابەندبووە بە رێگای پێشینە چاكەكان، لەگەڵ لێوەشاوەییەكی تەواو لە زۆر هونەردا، تامردن بەردەوام بووە لەسەر رێچكەكەی خۆی).

## حەوتەم:- السيوطي[3]:-

هەروەها ئەم زانایەش وەسفێكی پوخت و وردی (ابن الصلاح) دەكات، كە دەڵێت:- ((الإمام الحافظ شيخ الإسلام... يضرب به المثل، سلفياً زاهداً حسن الاعتقاد وافر الجلالة))[4]. واتە:- (پیشەواو شێخی ئیسلامەو وەك نموونە باسی لێوەكراوە، كەسێكی پاریزكارو خاوەن بیروبۆچوونی چاك و پایەبەرز بووە).

---

(١) ابن الصلاح, معرفة انواع علوم الحديث, مقدمة المحقق، ص٢٨.

(٢) البداية والنهاية, ج١٣, ص١٩٦.

(٣) (السيوطي) ناوی تەواوی (عبدالرحمن بن ابوبكر بن محمد الخضيري الاسيوطي), لە قاهیرە لە دایك بووە لە ماوەی نێوان(٨٤٩-٩١١ك) (١٤٤٥_١٥٠٥ز) ژیاوە لە دیارترین بەرهەمەكانی بریتیە لە (جامع الكبير, طبقات المفسرين), الزركلي, الاعلام, ج٢, ص٦٩.

(٤) طبقات الحفاظ, ص ٥٠٣.

